# کاروان

5

شوباتی 1983

گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەیە
ئەمینداریەتی گشتی رۆشنبیری ولاوان
بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا



■ لەم ژمارەیەدا ■

# کەسایەتی عێراقی بەپێی بۆچوونی سەرۆکی فەرمانده صدام حسین

لە ئاخاوتنەکەی سەرۆکی فەرمانده صدام حسین لەگەڵ تۆژینەری ئەمریکایی « کریستین موسس هیلمز » هەوڵدەدەین لەم نووسینەماندا چەند تیشکێك بخەینە سەر گرنگترین لایەنی بۆچونەکانی سەرۆك فەرمانده لەبواری کەسایەتی عێراقی . بەتایبەتی ئەم لایەنە گرنگە پێومرێکی سەرەکی‌یە بۆ ناسینی هەر گەلێ لەگەلانی جیهان .

**دەبا بزانین سەرۆکی فەرمانده لەم رووەوە چۆن بۆ مەسەلەکە چوە :**

( رێم بدە باهەندێ باسی شۆڕش‌و ژیانمانت بۆ بکەم . پێویستە بزانی کە یەکەم شتێ بیرمان لێکردەوە دوای ئەوەی لە کۆتایی سالی 1963دا بەرپرسیاری‌یەتێکی گرنگمان گرتە ئەستۆ ئەوەبوو کەبێ لەژیانی گەلەکەمان بکەینەوە . کە لەم روانگەیەوە دەستمان‌کرد بەکاری نهێنی . یەکەم پرسیاری سەرەکی‌ئەوەبوو ئایا بۆ گەلەکەمان بڕوای بە هیچ شتێك نەماوە . بڕوای بەکاربەدەست نی‌یەو بڕوای بە مووچەخۆری دەوڵەت نی‌یە . بڕوای بەدوارۆژ نی‌یە . متمانە بەو شتانە ناکا کە دەیانبینێ‌و گومان لەهەموو ئەو شتانەیش دەکا کەنایانبینێ‌و بەم جۆرە گەیشتینە ئەو بڕوا سەرەکیەی کە ئەم گەلە توانایەکی نائاسایی هەیە لەناو کرۆکیاو دەیەوێ بە رێگای راست‌و بەشێوەیەکی راست‌و قووڵ دەریبڕێ . بەڵام کاربەدەستان گەلیان ترنجاندبوە کەلەبەری تەسکی واوە نەیدەتوانی تیایانا وەك ئەوەی پێویستە کرۆکی خۆی دەربڕێ . شتێکی سروشتیە ئەگەر گەل لە کەلەبەری بچووکدا بەنگی پێ‌بخورێتەوە وەکو ئەوەی لێ‌دێ کە داوا لە کەشتی‌یەکی گەورە بکەین بچێتە ناو رووبارێکی بچووکەوە. هیچ گومانیش لەمەدا نی‌یە کە ئەمە ناگونجێ‌و ئەم نەگونجانەیش هۆیەکەی خۆیی نی‌یە بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوانەی کە بەرپرسیارن‌و نەیانتوانیوە بارێکی‌وا بهێننە کایەوە کە کەشتی‌یەکە روالەتی خۆی لەو چوارچێوەیەدا بەکاربێنێ کە بۆی دەستبدا . ئا بەم شێوەیە هەموو کاتێ گەلی عێراق بەنگەناو نەکرا . لەو کاتەوە کە ئەلقە پرشنگدارەکانی دەوڵەتی عەباسی رووخاوەو . هەموو جارێکیش بەرەقی رەوشتی لەگەڵدا دەکرا ) .

کەواتە وەك سەرۆکی فەرمانده بۆ مەسەلەی **پچڕاندنی** باوەڕی گەل بەکاربەدەستان‌و حوکمڕان‌و **دەوروپشتیان .** مەسەلەکە دەقاو ـ دەق وەك ئەو راستی‌یەیە کە « **چەپلە بەیەك** دەست لێ‌نادرێ » . کەواتە پچڕاندنی پەتی متمانەو باوەڕ ـیان باشتر بڵێین تالەمووی متمانە لەنێوان گەلی عێراق‌و کاربەدەستان‌و حوکمڕانان پێش شۆڕشی تەمموزی سالی 1968 هۆیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ گەمارۆدانی گەل لەلایەن ئەو کاربەدەستانەوەو هەوڵدانی لاوازکردنی کەسایەتی عێراقی‌بووە. لێرەدا زۆر جوان دەست‌نیشانی مەسەلەکەی کردوە کاتێ باسی پەك‌کەوتنی کەشتی‌یەکە دەکا لەکاتی فڕێدانی بۆ ناو تەنکاوەکەدا کە کەشتی بچووك تیایا توانای نی‌یە رێ‌بکا ، هەر ئەم هۆیانەشە کەتا ئێستاش گەلی عێراقی قینی لەووشەی « حوکومەت » یان میری دەبێتەوەو نایەوێ مامڵەتی لەگەڵدابکا تا ئەگا بە سەرۆك فەرماندەش صدام حسین کە ئێستا لە مەوقعی سەرۆك کۆماریشەوە نایەوێ مامڵەت لەگەڵ ووشەی « حوکومەت » بکات . ئەمەش گرێ‌یەکە تا ماوەیەکی درێژتریش دەمێنێتەوە لەناخی کەسایەتی هەموو عێراقی‌یەك .

**زۆر بەروونی سەرۆکی فەرمانده کەسایەتی عێراقی بۆ تۆژینەری ئەمریکایی « هیلمز » روون‌کردۆتەوە کە دەڵێ :**

« کەواتە لەسەرمانە ئەو بارە بڕەخسێنین کە هەموو پشوویەکی تیابدەین بەعێراقیەکان بۆ ئەوەی هەموو توانای بالاو هەڵقولاویان بەرەو رێبازو ئامانجی دەسنیشانکراو ئاراستە بکەن بەم جۆرە توانای بالاو هەڵقولاویان ئەنجامی باش دەبەخشێ لەجیاتی ئەوەی لە چوارچێوەی زیانبەخشداو لەچوارچێوەی زەرەمەندو خراپدا هەڵبقولێ ... ( هەموو کەسێك بەهەموو توانایەوە هەڵقولێ . لەگەڵ بەرینکردنی ئەو دیوارانەی دەرەوەدا کەهێز دەخەنە سەر کرۆکی دەروونی ئادەمیزادی عێراقی بەو پەڕی تواناوە کە هەیە ، بۆ ئەوەی دەرەتانێکی فراوان لەبەردەمیا بکرێتەوە . ئەو کاتە بەشێوەیەکی راست دەتوانین بەو کەسە بڵێین کە هەڵەی کردوە تۆ هەڵەتکردوە . بەو کەسەی کە لەرێ لایداوە تۆ لەرێ لاتداوە

نووسینی : عبدالستار طاهر شریف

1983-1-8

ئیتر بیانووی ئەوە ناهێلین کەوا فلان و فیسار بۆیە لەرێ لایانداوە چونکە دەرەتان و هەلی پێویستیان نەدرایە بۆ ئەوەی بەهەموو توانای خۆیانەوە بجوولێنەوە ، بۆ ئەوەیش وێنەکە تەواکەین دەبێ کاتێ کە بە عێراقیەکان دەلێین ئێمە بەگوێرەی ئەم سیاسەتە دەرۆین و ئەم دەستکەوتانەتان پێشکەش دەکەین).

دەستنیشانکردنی ئەم لایەنە گرنگە لە هۆیەکانی گرژبوونەوەی کەسایەتی یان بەکارهێنانی تواناو ووزەکانی تاکی عێراقی بە شێوەیێکی سەلبی ، لە ئەنجامی گەمارۆدانی لە لایەن کاربەدەستان و حوکمڕانەکانەوە ئەنجامێکی زۆر ئاسایەو رەچاو ناکرێ لە کەسایەتی عێراقی ئیجابی بەرامبەر بە مامڵەتکردنی نارەوای لێپرسراوان و حوکمڕانان . لەم روەوە سەرۆکی فەرماندە بەشێوەیێکی زانستی‌یانە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکە چووە ، ئەویش بە خاوکردنەوەی گەمارۆدانەکەو فراوانکردنی بوارەکانی تاکی عێراقی و هەستکردنی بەسەربەرزی و سەربەخۆیی لەدەربڕینی راکانی و تواندنی کەسایەتیەکەی ، ئەم رایەش بە باوەڕی ئێمە لەبینینی کەسایەتی عیراقیە بینینێکی گشتی بەشێوەی « الوحدة الكلية » گومان لەوەشدا نیە بۆچوونەکانی سەرۆکی فەرماندە لەئەنجامی تاقیکردنەوەو بەسەرهات و روداوەکانی ژیانیەتی لەمەڵبەندە جوارو جۆرەکانی عێراق چ وەك تاکێکی عیراقی و کوڕە هەژارو قاڵبووی زۆرانبازیەکانی ژیان ، چ وەك سەرکردەی پارتێیکی سیاسی و سەرۆك فەرماندەیەك باوەڕی بەگەلەکەیەتی و مامڵەتکردنی لەگەل بچووکترین رووداوەکانی رۆژانەی عێراق و هەست و نەستی جەماوەری گەلی عێراق بەکوردو عەرەبیەوە بەموسلمان و مەسیحیەکانیەوە باشترین بەلگەیە بۆ ئەم بۆچوونەمان .

## دەبا بزانین مەسەلەی کەسایەتی تاك و کۆمەڵی عیراقی چۆن شی‌کردۆتەوە :

( بەگشتی وەهەموو عێراقی‌یەك موسلمان‌بێ یا مەسیحی، کوردبێ یا عەرەب . لە هەموو تایەفەو کۆمەلێك ، کە ئەلێم هەموو عێراقی‌یەکان مەبەستم هەموو چواردە ملیۆنەکەی رۆلەکانی عێراق نی‌یە بێ جیاوازی بەلکو مەبەستم زۆربەی زۆریانە کە بریتین لەگەل . دەلێم هەموویان هەست بەوە دەکەن کە بەشێکیان هەیە لەم رژێمەدا .

لەمەوپێش لەسەر بناغەی هەل لەگەل رژێمەکاندا دەجوولانەوە ، سەرۆك هۆز دەیویست خۆی لە رژێم نزیك بخاتەوە بۆ ئەوەی دەستکەوتێ بۆ خۆی یا بۆ هۆزەکەی وەدەست بهێنێ ، تیمارخانەی ئەخستە ناوچەیەکی نزیکەوە یا پاسەوانێکی لەو قوتابخانەیەدا دادەمەزراند کە لە هۆزەکەیەوە نزیکە ، ئەگەر دێکەیەکی گشتی هەبوایە هەولی ئەوەی دەدا هێلەکەی لابدا بۆئەوەی لەناوچەکەیەوە تێپەربێ بۆ ئەوەی ئەندامانی هۆزەکەی بخاتە ئیش و سوود ببەخشێ و سوود وەرگرێ و ئەگەر حوکمێکی تایفەگەریش هات ئەوا هەندێ تایفەگەری ئاسۆ تەسك هەولی ئەوە دەدەن بەباشترین شێوە سوود لەم هەلە وەرگرن بەم یا بەو شێوەیە ، بەلام ئێستا ، لەگەل ئەوەدا کە عێراقی‌یەکان شانازی بەو گۆڕانە ئابووری و کۆمەلایەتی‌یەوە دەکەن کە لە ژیانیاندا بوەو بە مەسەلەیەکی سەرەکی گەورەی دادەنێن لە ژیانیانا ، لەوە گرنگتر ئەوەیە کە هەموو هەستی ئەوە دەکەن کەوا بەشداری دەکەن لەبنیاتنانی عێراقی مەزنی فراوان ، ئەو عێراقەی کە گشتیان لە سێبەری‌دا هەست بە سەربەرزی و شانازی دەکەن ) .

هەستکردن لەلایەن تاکەوە یان کۆمەل بە بەشداربوونی لە دورستکردنی وولات ، یان لە دامەزراندنی هەر رژێمێك ، لایەنی ئیجابیەت و هاریکاری زیاتر ئەنوێنێ لە مامڵەتکردندا لەگەل کاربەدەستان و رژێمەکە . بەلام لەکاتی بەشدار نەبوونی لە دورستکردنی وولاتەکەی یان رووداوەکانی رۆژانەی وولات ، ئەو کاتە خۆی بەنامۆ دەزانێ و هەولدەدا بەهەر شێوەیەك بێ شتێ بۆخۆی بپچڕێتەوە یان بۆگروپەکەی . ئەم لایەنەش سەرۆك کۆمار چارەسەری کردوە لەهێنانەوەی چەند بەلگەیەکی وەك سەرۆك هۆزەکە لەکاتی مامڵەتکردنی سەلبی و لەگەل بەراوردکردنی لەگەل وەزعی ئێستای گەلی عێراقی و بەشداربونیان لەدورستکردنی عێراقی مەزن .

## پاشان هەڤالی تێکۆشەر صدام حسین دەلێ :

( کاتێ کە یەکێ ئەکرێ بەهاوڕێت بەو سیفەتەی تاکێکە لەکۆمەل و دوای ئەوەی ماوەیەك لەگەلیا بەهاوڕێیەتی دەمێنێتەوە ، وادەبینێ کەوا خاوەند باوەڕێیکی توندەو پەیوەندی بەهێزە بە مەسەلە مرۆڤایەتیەکانەوە پەیوەندیەکی گەرم و راستەقینە ، بەلام جاری‌واش هەیە هەندێکیان تەنها بەگەیستنی بەکورسی میری و دانیشتنی لەسەر کورسی‌یەکە لەگەل حالەتەکەدا مامڵەتێکی مرۆڤایەتی قوول ناکا . بەلام ئەو کاتەی تەنها هاونیشتمانی‌یەکە خەریکی راپەڕاندنی ئیش‌وکارەکانی ئەبێ وەك تەواوکردنی موعامەلەی تاپۆی زەویەکەی یان خانوەکەی . بۆ بەلگە یان دانانی پارەوپوول لەبانق وەیاخود راکێشانی تەلەفۆن . ئەو کاتانە هەولئەدا بەزوترین کات ئیش‌وکارەکانی راپەڕێنێ . بەلام کاتێ‌خۆی دەبێتە بەڕێوەبەری تاپۆو یەکێ لەهاونیشتمانیەکان داوای جێبەجێکردنی موعامەلەکەی لێ‌بکا بە پەلە . ئەو کاتە بەو ئەرکەی هەلناسێ وەکوو پێویست ، وەمامڵەتێکی مرۆڤایەتیانە ناکا لەگەل خاوەند ئیشەکان وەکو پێویست ) .

ئەمە هێنانەوەی دوو نموونەیە لەکەسایەتی عێراقی و

بەڕای هەڤاڵ صدامیش زۆربەی زۆری کۆمەڵی عێراقی خاوەند کەسایەتی دروستن healtty healtty نەك کەسایەتی دووفاقی personality dual وەبەڕای سەرۆکی فەرماندە تا مەسەلەی کەسایەتی مزدوج personality dual کە دوایی دبێتە سەر باسی بەو تێگەیشتنە نەخۆشی‌یە نیـــە لەکەسایەتی ، کەزانستی کەسایەتی تەفسیری‌دەکا .

ئەو تاکانەی خەراپن‌و لەپلەی ژیانیاندا بە جیاواز ماملەت لەگەڵ خەلکی دەکەن ئەوانە کەمن‌و رەوایـــە ناویان لێ‌بنێین نەخۆشی یان کەسایەتیە دوو فاقی‌یەکان لەجۆری کەسایەتیـە نەخۆشەکانە نەك ساغو دوروستەکان .

کاتێ کەتوێژینەر « هیلمز » پرسیاری‌کرد لە ســـەرۆکی فەرماندە دەربارەی راکەی توێژینەری کۆمەڵایەتی علي الوردی کە ( علی الوردی ) رای وایە کەسایەتی عیراقی کەسایەتی‌یەکی ازدواجیە لەلایێك لەوانەیە عێراقی زور توندو تیژ بێ‌و لەلایەکی تریشەوە لەوانەیە زۆر نەرم‌و سەخی‌و خۆشەویست‌بێ . ئایا ئێوە یەعنی سەرۆك کۆمار رێك‌کەوت لەگەڵ ئەمە رایەو چۆنی لێك‌ئەدەنەوە وەئایا هۆیەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ هۆیـــــــەکانی مێژوویی .

بەڕای ئێمە سەرۆك کۆمار ئەو رێگەیەی لە توێژینەرو لـە مامۆستا علی الوردی داخستووە کە یاری‌وگەمە بەووشـــەو مصطلحات بکەن بۆ ئەوەی ووشە نەبێتە کۆســـپ لەرێگای پێشکەوتن‌و زانست . هەر بۆیە ئەو بەلگانەی هیناویەتیەوە هەموی لە واقعی ژیاندایە . دووفاقی کەسایەتی وەك ئەوە نیە کەباستانکرد ، دووفاقی کەسایەتی ئەو مانایە دەگرێتەوە کەوا یەك کەسایەتی دووفاقی کەسایەتی هەڵدەگرێ ، لەلایەکەوەوا دەردەکەوێ کەوا حەز بەخێرو مرۆڤایەتی دەکا وەلەلایەکی ترەوە بەبێ ئەوەی گۆڕانێکی جەوهەری رووبدا لەزەرفەکە یـــا دەر بکەوێ کەوا حەز بەخێرو مرۆڤایەتی دەکا وەلەلایەکی ترەوە خێرو مرۆڤایەتیش بێ، ئەمە لەوانەیە رووبدا وەك نەخۆشی‌یەك لە نەخۆشی‌یەکانی کۆمەڵایەتی ، کە لەوانەیە لەهەر کۆمەڵێــك رووبدا ) .

لێرەدا سەرۆکی فەرماندە وەك لەسەرەتای نووسینەکەماندا بۆی چوین دووفاقی کەسایەتی personality dual لەگــــەڵ کەسایەتی دروستی personality healthy جیاوازکردۆتەوە . بەڵکو ئەو جۆرە کەسایەتیانەی بەکەسایەتی دروست داناوە . ئەمەش ئەو راستی‌یەمان بۆ ئاشکرا ئەکا کەوا هیـچ گەلێـــــك لەگەلانی جیهان تووشی نەخۆشی دووفاقی کەسایەتی نـابن ، ئەگەر ئەم جۆرە نەخۆشی‌یانە هەبێتیش لای چەند تاکێــــك لەریزی کۆمەلگاکە روودەدا .

## بەبۆنەی رێزلێنانی سەربازە کوردەکانەوە لەلایەن سەرۆکی فەرماندە «صدام حسین» ەوە

بەراستی رێز لی‌نانی بەرێز سەرۆکی تێکۆشەر کاك صدام حسین لەژمارەیەك سەربازی کورد بەدەسکەوت‌و بایـەخێکی گەورە دائەنرێ لەلایەن رۆڵەکانی گەلی کوردمـــان بۆ ئەوەی ژیانێکی ئاسودەو کامەرانیان بۆدابین بکـــرێ ، وەکو رون‌و ئاشکرایە کە هەر لەگەڵ دەست‌پێ‌کردنی جەنگی قادسیەی صدام رۆڵەکانی گەلی کوردمان شان بەشانی برا عەرەبەکانیان بەشداریەکی یەکجار چاکی ئەم جەنگەیان کـــرد دژی رژێمی ئێرانی بەکرێ گیراو .

جا لێرەشدا دەبێ ئەوەمان بێتەوەیاد کە پارتی‌و شۆڕش رۆژ لەدوای رۆژ بایەخی چاکتریان داوە بەگەلی کوردو ناوچەی کوردستان . لێرەدا پەیمان‌و بەڵێن سەر لە نوێ بـــۆ بەرێز سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین تازە دەکەینەوە کە لەریـــزی پێشەوەی جەنگاوەرانی پارتی‌و شۆڕشدا بین بـۆ پاریزگاری کردنی خاکو مافە رەواکانی وولات‌و دەسکەوتە بەنرخـــەکانی گەلەکەمان .

سەرکەوتن بۆ عیراقی شۆڕش

مردن‌و سەر شۆڕی بۆ دوژمنانی گەلی عیراق

محمد محی‌الدین

# پرۆگرامی ساڵی «1983»ی

# «کاروان»

1 - بەردەوام بوون لەسەر دەرکردنی «گۆڤار» مانگ بە مانگ .

2 - سەرپشت خستنی دەرگایەکی تازە بە ناوی (بابەتی هەڵبژاردەی - کاروان -) ەوە .

3 - دەرکردنی ژمارەیەکی تایبەتی بۆ شانۆگەری چ خۆماڵی بێ و چ وەرگێڕاو و ژمارە «9»ی مانگی حوزەیرانی بۆ تەرخان بکرێ .

4 - دەرکردنی دوو پاشکۆ بە چاپێکی جوان و رەنگاو رەنگ ، یەکەمیان پاشکۆی ژمارە «6»و تەرخان بکرێ بۆ هەفتەی (قادسیەی صدام و جەژنەکانی ئازار) .
دووەمیان پاشکۆی ژمارە «10»و تەرخان بکرێ بۆ «شۆرشی 17 — 30ی تەمووز» .

5 - دەرکردنی پاشکۆی تر بۆ هەر بۆنەیەکی تری پێویست بە پێی بارو دۆخ .

6 - کردنی چیرۆك و باس و لێکۆڵینەوەکانی دیداری دووەمی چیرۆکی کوردی بە کتێبێك .

7 - رێکخستنی کۆڕێك بۆ نوێنەرانی رۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکان بە نیازی یەکخستنی رێنووسی کوردی لە بواری رۆژنامەگەریدا .

8 - بایەخدان بە بەرهەمی لاوان و تەرخان کردنی چەند لاپەرەیەکی هەر ژمارەیەك (بە پێی بوون و نەبوونی بەرهەمیان) بۆ ئەم مەبەستە .

9 - رێکخستنی کۆڕێك بە بۆنەی تێپەڕ بوونی ساڵێکەوە بەسەر دەرچوونی یەکەم ژمارەی «کاروان»دا بە مەبەستی کۆڵینەوە لە رەوتی گۆڤارەکە لەو ساڵەداو وەرگرتنی راو ئامۆژگاری و پێشنیازی بەشداران سەبارەت بە چوێنیتی‌ی پێشخستنی . ئەم زاتانەش بەشداری‌ی تێدا دەکەن :

أ - دەستەی نووسەرانی گۆڤار .
ب - کارکەرانی گۆڤار .
ج - گشت ئەو نووسەرانەی بەشداری ژمارەکانی ساڵەکە بوون .
د - ئەوکەسانەی ترکە ئامادەبوونیان بە پێویست دەزانرێ .

کۆڕەکە لە رۆژی (20)ی مانگی تشرینی یەکەمدا دەبێ .

10 - سازکردنی ئاهەنگێك بە بۆنەی تێپەڕ بوونی ساڵێکەوە بەسەر دەرچوونی یەکەم ژمارەدا . ئاهەنگەکە لە شەوی 21/20 ی مانگی تشرینی یەکەمدا دەبێ .

---

# بانگەوازێك

## بۆ گشت شانۆگەری نووسانمان .

بۆ جێبەجێ کردنی بەندی «3»ی پرۆگرامی ساڵی «1983»ی «کاروان» بەو شێوەیەی کە هەموو لایەکمان ئەرکی سەرشانی خۆمان لە ئاست باری ئەدەبی و رۆشنبیری‌ی گەلەکەماندا لەو بوارەدا بەجێ بێنین ، تکاتان لێدەکەین کە هاریکاریمان لەگەڵدا بکەن و بە بەرهەمی جوان و رەنگینی خۆتان ئەو ژمارە تایبەتی‌یەمان چاك بۆ برازێننەوە کە تەرخانە بۆ «شانۆگەری» .

تەنیا مەرجیشمان ئەوەیە کە بەرهەمەکانتان پێش (1)ی ئایاری «1983» بگاتە دەستمان و پێشەکی سوپاستان دەکەین ..

«دەستەی نووسەران»

د . کەمال مەزهەر

پێشکەشە بە « یەکیەتی نووسەرانی کورد »

# ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ لەبەر رۆشنایی تاقیکردنەوەکانی ئەوروپای رۆژگاری « رێنیسانس »دا

– بەشی دووەم –

**سەرەتا :**

لە بەشی یەکەمی ئەم وتارەدا باسی باری ژیانی ئەوروپاو کێشەکانیمان لە کۆتایی سەدە ناوەنجییەکاندا کرد ، لەوێدا دیمان چۆن رژێمی دەرەبەگی بەگشتیو کڵێسەو پیاوەکانی بەتایبەتی بووبوونە بارێکی یەکجار قورس بەسەر شانی کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتانی ئەوروپاوە ، بێ لابردنی ئەو کۆسپە رەورەوەی مێژووی ئەو پارچە گرنگەی جیهان بە هیچ جۆر نەیدەتوانی بەرەوپێش بڕوات . بەشێکی زۆر لە ئەرکی تەختکردنی ڕێگای قۆرتە گەورەکانی ئەو قۆناغە کەوتە ئەستۆی پێشەنگی دەستەی ڕووناکبیری ئەوسای ئەوروپاوە . وەك گوتمان یەکەم ئەدیبی لێهاتوو کە ئەو ئەرکە پیرۆزەی گرتە ئەستۆ دانتێ ئەلیجیری بوو . زۆری نەبرد دوو ناوداری تری دیسان فلۆرەنسەی ئیتالیا هاتنە ئەو کۆڕەوە کە دانتێ یەکەم ئاڵای سەرفرازیی نوێی تێدا هەڵکرد ، یەکەمیان پێتراركو دووەمیان بۆکاشیۆ بوو .

**فرانچێسکۆ پێترارك :**

**با جەنگەوارییی جارانمان زیندوو بکەینەوە !**

**– پێترارك –**

شوێنی پێترارك لە ژیانی ڕووناکبیریی ئەوروپای کۆتایی سەدە ناوەنجییەکاندا هێندە دیارو گەورەیە وای لە زۆر مێژوونووس کردووە نازناوی « باوکی ڕێنیسانس »ی بۆ هەڵبژێرن . گەر پێترارك دروست لە ئەرکەکانی قۆناغ

تێنەگەیشتایەو دڵسۆزانە بەدوای دەرمانی نەخۆشی‌یەکانیدا نەگەڕایە هەڵبەت شیاوی ئەو شوێن‌و پایە بەرزە نەدەبوو .

ڕۆژی 20ی مانگی تەمموزی ساڵی 1304 فرانچێسکو پێترارك (Fronceso Petraca) لەناو خێزانێکی بازرگانی فلۆرەنسەیدا چاوی هەڵهێنا . وەك کاتی خۆی گوتمان بازرگانەکانی ئەوسای ئیتالیا لە هەموان زیاتر دژی ڕژێمی دەرەبەگی‌و عەودالی لەناوبردنی کۆت‌و زنجیری ژەنگاویی سەدە ناونجی‌یەکان بوون ، بۆیەکا باوو باپیرو کەس‌وکاری پێترارك بە دەستووری دانتێ سەر بە پارتی سپی‌یان بوون . ئەوانیش لەگەڵ دانتێ بەرلەوەی پێترارك بۆخۆی لەدایك‌ببێت لە فلۆرەنسە دوورخرانەوە(1) . کەوابێ هەر لە کۆرپەیی‌یەوە پێترارك بووە یەکێك لە قوربانی‌یەکانی کۆن‌و کۆنەپەرستان ، ئەوەی زۆر زوو لە هەست‌و نەستیا ڕەنگی دایەوە .

لە تەمەنی دوازدە ساڵی‌یەوە پێترارك کەوتە خوێندنی یاساو ئایین‌و ساڵی 1326 بووە فەرمانبەری کڵێسە . لە هەرەتی لاویدا بە شارانی ئیتالیاو وڵاتانی ئەوروپادا گەڕا . پێترارك زۆر لەنزیکەوە تێکەڵی خەڵکی ساکار دەبوو ، جاری‌وا هەبوو بەرگی جووتیاری دەپۆشی‌و وەك فەلاحان دەچووە کێلگەو ڕاوی لەگەڵ دەکردن ، پێترارك بەشی زۆری ژیانی لە شاری ئەڤینیۆن بردەسەر کە ئەوساکە پایتەختی پاپاو مەڵبەندی گەورە پیاوانی کڵێسە بوو(2) . هەمیشە عاشقی بەرزیی ژیان‌و جوانیی سروشت بوو ، هەردووکیشیان لەگەڵ خۆی بەخشندە بوون ـ باڵابەرزو چاوگەش‌و خوێن‌گەرم ، زیرەك‌و جوست‌و نموونەی وریایی بوو . کەم هەبوون بەرادەی پێترارك لە ئاوازی سات‌و سەنتوورو زیل‌و بەم تێبگەن ، بۆ خۆیشی ، وەك دانتێ ، لە هەندێکیاندا وەستابوو .

خوێندن‌و کارو جۆری ژیان‌و گەشتەکانی فرانچێسکو پێترارك بۆی‌بوونە سەرچاوەی ڕەسەنی تێگەیشتنی لایەنی جیاوازی ژیانی گەل‌و نیشتمان . هەر زوو بیری وردی پاڵی پێوە نا بکەوێتە بەراوردێکی بەجێ‌و ڕەوا لەنێوانی ڕابوردووی ئیتالیاو ڕۆژانی سەردەمی خۆیدا ، گەر بەر لە پەیدابوونی دەسەڵاتی فراوانی سەردارانی کڵێسە ئیتالیا یەکگرتوو ، پێشکەوتوو ، دەنگی زوڵاڵ بووبێت ، ئەوا دیارە دەبێت لادانێکی گەورە بووبێتە کۆسپ‌و هۆی مەینەتی‌و دواکەوتنی گەل‌و نیشتمان . ئەو بۆچوونە هەستی سۆراخی ڕابوردووی لە ناخی دەروون‌و مێشکی پێتراركدا هەڵکەند . ئەوساوە پێترارك دەستی‌دایە کۆکردنەوەو لێکدانەوەی پاشماوە دێرینەکانی نیشتمان ، بەتایبەتی دەستنووسی کۆن کە کون‌و کەلەبەری ئیتالیاو ئەستەموول‌و دەوروبەریانی بۆ تەی‌کرد . بۆ خۆی نزیکەی 300 دەستنووسی دانسقەی کۆکردەوە کە هی‌وایان تێدابوو کەس بە بوونی نەدەزانی . هەر دەستنووسێکیشی بۆ نەکردرایە یەکسەر ڕوونووسی دەکرد . بەوجۆرە پێترارك کتێبخانەیەکی پێکەوە نا کە ئەوساکە لە سەرانسەری ئەوروپادا لە وێنەی نەبوو(3) .

فرانچێسکو پێترارك زۆربەی ژیانی بۆ لێکدانەوەی ئەو دەستنووسانە تەرخان‌کردو هەر لەبەرئەوەش لاتینی‌یەکی عەنتیکە فێربوو ، بە یۆنانیشەوە خۆی خەریك‌کرد تاوەکو بتوانێت یەکسەر لە ناوەڕۆکی بەرهەمی فەلسەفی‌و رووناکبیریی گریکیی کۆن تێبگات(4) .

پێوەلکانی بێ‌ئەندازەی پێترارك بە ڕابوردووەوە کارێکی وای کرد ئەو لە دانتێ زیاتر بایەخ بە زمانی لاتینی بدات‌و زۆرتری پێ بنووسێت چونکە دەیویست ، خۆی‌وتەنی ، هەموو نووسەرانی ئەورووپا لە بەرهەمەکانی تێبگەن(5) . بەڵام ئەو بەرهەمانەشی کە بە زمانی زگماکی خۆی نووسیونی زۆرن‌و دەوریان لە دارشتنی ئیتالیایی نوێدا کەم نی‌یە . لە هەردووکیشیاندا ، وەك دانتێ ، مرۆڤی هلوچەرخ‌و نیشتمانی مەبەست بوو . پێترارك یەکەم کەس بوو وشەی مرۆڤایەتیی(6) لە ڕۆمانەکانەوە وەرگرت‌و جێگەی دیارو شیاوی لە نووسینەکانیدا بۆ تەرخان‌کرد . مەبەستی بەرودوای پێترارك لەوەدا قوتارکردنی مرۆڤ‌و بەر لە هەر شت بیری مرۆڤ بوو لە بەندو ئەسارەتی سەدە ناونجی‌یەکان ، چونکە باش دەیزانی بێ کارێکی ئەوتۆ سەرفرازیی نیشتمان خەوی بێ‌ئەنجامە ، لەوەدا پێترارك مەبەستێکی گەورەی تریشی هەبوو ، بە دەستووری دانتێ ، ئەو جۆری مرۆڤ نەك وەجاغی مەبەست بوو . وەجاغزادەی ڕەسەن لای پێترارك ئەو کەسەیە کە بۆ کارو پیشەو بیرو گەل‌و نیشتمانی خۆی دڵسۆزە .

فرانچێسکو پێترارکیش ، وەك دانتێ ، خۆشەویستیی تێکەڵ بە شیعرەکانی کردو جارێکی‌تر سەلماندی کە ئەدیب دەبێت دووی کڵاوی‌بابردوو نەکەوێت بەڵکو ئاوازی خۆش بۆ ژیان بڵێت . هەر لەبەرئەوەش شیعرەکانی پێترارك کە بە ناوەڕۆك‌و بە ڕوخسار ڕازاوەو دەوڵەمەندن یەکسەر کەوتنە سەر زاران ، هەموان بەپەرۆشەوە دەیانقۆستەوە ، دیسان هەر لەبەرئەوەشە کە شیعرەکانی پێترارك تا ئیمڕۆکەش زیندوون ، هەرچەندە تەمەنیان خەریکە لە 600 ساڵ تێپەڕ دەکات .

پێترارك گیرۆدەی خۆشەویستیی شۆخێکی مێرددار بە ناوی لۆرا ( لاورا )وە بوو . لە تەمەنی بیست‌وسێ ساڵیدا لۆرا لە کڵێسەیەکی ئەڤینیۆن لە تەلی دڵی پێترارکی دا ، بەڵام تا دوا هەناسەی ژیانی ناونیشانی نەدا بەدەستەوە نەبا ،

خوانەکەردە ، ناوی بزرێ ، یادی لە سینەی خۆیدا پاراستو نەمری لە شیعرەکانیدا بۆنووسی بێئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان توخنی بکەوێت . لەوەدا پێترارکی مرۆڤ وەك پێترارکی هونەرمەندو وەك شیعرەکانی بەرز بوو . پێترارك دەربارەی خۆشەویستیی لۆرا نووسیویە دەڵێت :

**« سەعات یەکی ڕۆژی شەشی نیسانی سالی 1327 بۆ یەکەمجار لە کلێسەی سانتا کلارای شاری ئەڤینیۆن چاوم بە لۆرا کەوت کە لە گۆرانیەکانمدا دەنگی دایەوە . سالی 1348یش هەر لەو شارەو هەر لەو مانگەو ڕۆژو سەعاتەدا ئەو خۆرە لە ژیانمدا ئاوابوو »(7) .**

پێترارك وەستایانە ناوی لۆرای لە شیعرەکانیدا بەکاردەهێنا، کەڵکی لەوە وەردەگرت کە لۆرا واتای ئەو گەڵا دەگەمەنە دەبەخشێت کە ڕۆمانەکان کاتی خۆی تاجەگولینەی سەرکەوتنیان پێ دەچنیو کە پاشان دانیشتوانی ئیتالیا وەك نیشانەی قەدرو ڕێز یەکێکیان لێ نایە سەر سەری خۆی . پێترارك ئەو مانا بەرزەی بۆ خۆشەویستێکی ڕەسەنیتری تەرخانکرد ـ نیشتمان !.

خۆشەویستیی نیشتمان لای فرانچێسکۆ پێترارك بێسنوورو بێئەندازە بوو ، ئەوەش دیارە ، لە تێکەیشتنی بێلادانی ئەرکەکانی قۆناغەوە هاتبوو . هەر لەو قوژبنەشەوە سەیری مێژووی سەردەمی ڕۆمانەکانی دەکردو ئەو هەموو بایەخەی بە ڕابردوو دەدا ، دەیویست لەوڕێکەیەوە بە وردی لە هۆکانی هێزو دەسەڵاتی ئەوسای نیشتمان تێبگات . کەم شت وەك دابەشبوونو پارچەپارچەیی ئیتالیا هەناوی دەهەژاند ، پێترارك چاوی بەرایی نەدەهات ڕۆمای کاولو دواکەوتوو ببینێت ، کوژراوی ئەوە بوو ڕۆما بگەڕێتەوە دۆخەکەی جارانی، بگەڕێتەوە ئەو ڕۆژگارەی لە سەرتاپای جیهاندا شارێك نەبوو شان بدات لە شانی ، دەیویست ئەو سەردەمە بێنێتەوە یادی هاوچەرخانی کە نیشتمان تێیدا نە سوخرەکێشی ئەم نە گیرۆدەی دەستی ئەویان بوو ، لەپێناوی بووژاندنەوەی ڕۆمای خۆشەویستیدا پێترارك تەنانەت پاپاکانی هاندەدا لە ئەڤینیۆنەوە بگەڕێنەوە ئیتالیا ، بە وشەی نازدارو هەڵبژاردە لە تەلی هەستی هەموانی دەدا :

**« ئاخۆ کێ بێت گومانی هەبێت**
**کەی ڕۆما هۆشی وەبەرخۆیدا هاتەوە ،**
**جەنگاوەرییەکەی جارانمان دەژێتەوە ؟»(8)**

■ ❃ ■

**« ئەی خوێنی لاتینی بەڕێز هەڵچۆ(9)**
**کۆتو زنجیری ئەستۆت بخەرە ژێر پێتەوە ! »(10)**

ئا بەوجۆرە پێترارك هاونیشتمانییانی دەبزواند ، بە چرای پرشنگداری وشە ڕێگەی ڕاستی نیشاندەدان . دیارە دەبوو دووربینێکی وەك پێترارك بە هەستەو بە گیانو بە قەڵەم لەگەڵ هەموو دیاردەو بزووتنەوەو ڕووداوێکدا بوایە کە تروسکەی هیوای بۆ گەلو نیشتمان الێ بەدیبکرایە . لەبەرئەوە زۆر بەگەرمی پشتی ئەو ڕاپەڕینەی گرت کە بەهاری سالی 1347 چەوساوانی ڕۆما دژی دەرەبەگەکانی بەرپایانکردو ئالای کۆماریان بە سەرکردایەتی کۆلا دی ڕێنزۆ(11) تیا هەڵکرد . پێترارك بۆخۆی هاوڕێی کۆلادی ڕێنزۆ بوو ، پێکەوە چەند سالێکیان لە شاری ئەڤینیۆن بردەسەرو کاری زۆری کردە سەر ڕێبازی ژیانو جۆری بیرکردنەوەی . لە « گیانی بەرز »دا کە یەکێکە لە شاکارە نەمرەکانی ، پێترارك بەپەرۆشەوە کۆلا دی ڕێنزۆی هاوڕێی بۆ ڕزگارکردنی نیشتمان هاندەدا(12) .

بە هەمان دەستوور فرانچێسکۆ پێترارك ڕووی دەمی دەکردە هەموان ، بەشی زۆری شیعرەکانی نامەن بۆ پاپاو میرو پاشاو نووسەرە مردووەکان ، دەیویست لە چاکەو خراپەیان وێنەی ڕێگەی ڕاست بۆ نەوەی هاوچەرخو دواڕۆژی ئیتالیا بکێشێت . هەر لەبەرئەوەش بەشێکیتری شیعرەکانی نامەن بۆ نەوەی داهاتوو ، بۆئەوانەی هێشتا لەدایك نەبوون . لە شاکاری « ئیتالیای نیشتمانم »و « نامە بۆ نەوەی داهاتوو »(13)و « ئەفەریقا »(14)و بەرهەمی تریدا ، کە بەداخەوە بەشێکیان فەوتاون ، لەوجۆرە نامانەی پێترارك بەدیدەکرێن .

پێترارکیش ، هەرچەندە وەك دانتێ ئیماندار بوو ، لە بەشێك لە نامەکانیدا زۆر بەتوندی ڕەخنەی الە کلێسەو ڕەفتاری ناهەمواری سەردارانی گرتووە . لەبەرئەوەی پێترارك لە کلێسە خوێندبووی‌و ماوەیەك فەرمانبەری دەزگایەکی ئاینی بوو و بەشی زۆری ژیانی لە ئەڤینیۆنی پایتەختی ئەوسای پاپاو کاردینالەکان بردبووە سەر ، لەبەر ئەوانە زۆر چاك ئاگاداری بەدفەڕیی کاربەدەستانی کلێسە بوو. نەشتەری ڕەخنەی نامەکانی هێند لێیان تیژ بوو تا مردن زاتی نەکرد بەشێکیان بڵاوبکاتەوە . « نامە بێناونیشانەکان » ناونیشانی ئەو شیعرانەی پێتراركە کە کلێسەو پاپاو قەشەو ڕەبەنە بەڕەڵاکانی پێ ڕیسوا کردوون .

لەگەڵ ئەو هەموو بۆچوونە وردانەیدا پێترارکیش ، بە

دەستووری دانتێ ، نەیتوانی بەتەواوەتی خۆی لە کۆتی کۆن ڕزگار بکات . بۆیەکا ئەمیش وەك ئەو، کەوتە چەند هەڵەیەکەوە، ڕاستە پێترارك لە بەرهەمەکانیدا لە ژیانی سەرزەمین دوورنەکەوتەوە ، یەکسەر دەدوا ، بێ سڵ کردنەوە کەڵکی لە بەرهەمی شاعیرە بتپەرستەکانی وەك ڤێرجێل وەردەگرت(15)، بەڵام لە هەڵبژاردنی ئەمرازی گۆڕیندا چاك نیشانی نەپێکا .

لەبەرئەوەی ئەو هێزانەی ئەو پەنای بۆ دەبردن لە ژیانی خۆیدا هیچیان بۆ هەڵنەسوڕا ، ئەویش پەلەی بوو ، باش لە تەمەنی درێژی مێژوو و هێزە بزوێنەکانی تێنەدەگەیشت ، لەبەرئەوە بێهوودە لە دواسالانی تەمەنیدا ڕووی کردە ئیمپراتۆریی پیرۆزی ڕۆمانی(16) ، دەیویست بەزۆر گیانی بکاتەوە بەبەرداو لەو ڕێگەیەوە بنیاتی ڕزگاریی نیشتمانو ئازادیی گەل بنێت ، بەر لە کۆچی دواییشی لە ژمارەیەك لە بیرە وردەکانی زووی دەربارەی ژیان پاشگەز بۆوەو بەرهەمێکی بەناوی « تەحقیری ژیان »ەوە(17) بڵاوکردەوە . هەر بەوهۆیەشەوە پێترارك دوارۆژانی ژیانی بە گۆشەگیری بردەسەر . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕۆژی نۆزدەی تەمموزی ساڵی 1347 لە ئارکوای نزیك پادواوە چاوی لێكنا ، نیشتمانو گەلی لەیادنەکرد .

فرانچێسکو پێترارك ، بێگومان ، شایانی ئەوەبوو یەکەر جێگەی ڕەوا لە قووڵایی دڵسۆزاندا بۆ خۆی بکاتەوە . نازناوی میری شاعیرانو ڤێرجێلی نوێی پێ ڕەوا بوو . لە ڕۆژانی ژیانی خۆیەوە بە دەیان ئەدیبی ئیتالی لە دەوری بەرهەمە نازدارەکانی کۆبوونەوەو نوێکاریی لێوە فێردەبوون ، لە نووسینو خوێندنەوەدا لاسایییان دەکردەوە ، بەڕادەیەك « پێترارکیزم » بووە زاراوێکی باوی ناو کۆڕە ئەدەبییەکانی ئەوسای ئیتالیا ، بۆکاشیۆی ناودار یەکێك لە شاگردو هاوڕێ نزیکەکانی پێترارك بوو کە تەنانەت بە شێوەش تا ڕادەیەك وێکدەچوون(18) .

**جیۆڤانی بۆکاشیۆو هەزارو یەلاشەوەی ئەورووپا :**

**هەژاری لە سامان بێبەریمان دەکات ، بەڵام ناتوانێت دەست بۆ ئابروومان ببات !**

**ــ بۆکاشیۆ ــ**

شارەزایان بۆکاشیۆ بە سێیەمین پێشەنگی کاروانی ڕووناکبیرانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس دادەنێن ، لەبەرئەوە شوێنی ئەویش لە تۆماری ئەمرانی مێژوودا دیارو پرشنگدارە .

ساڵی 1313 جیۆڤانی بۆکاشیۆ (J. Boccaccio) لە پاریس لە باوکێکی بازرگانی ناسراوی فلۆرەنسەییو دایکێکی نەناسراوی فەرەنسەیی لەدایكبوو(19) . هەر بە منداڵی باوکی هێنایەوە ئیتالیاو چەند ساڵێکی ناخۆشی لەگەڵ بلوەژنی لە شارێکی نزیك فلۆرەنسەدا بردەسەر . لە تەمەنی دە ساڵیدا باوکی ناردییە شاری ناپۆلی بەو نیازەی وەك خۆی ڕێگەی بازرگانی بگرێتە بەر ، بەڵام بۆکاشیۆ لەوساوە ئارەزووی خوێندنەوەو دانانی شیعر دای لە کەلەی ، شیعری بە خۆراکی هەزار دادەنا . بۆکاشیۆ تەنانەت مەیلی نەدایە خوێندنی یاساو ئایینیش کە حەزی دووەمی باوکی بوون . لە هەرەتی لاوییەوە بۆکاشیۆ تێکەڵ بە دەستەی ڕووناکبیری ناپۆلی بوو کە ئەویش ئەوسا ، وەك فلۆرەنسە ، یەکێك بوو لە شارە پێشکەوتووەکانی ئیتالیا . وادیارە سەرەتای خوێندنەوەی قووڵی بۆکاشیۆ بە بەرهەمی دانتێو پێترارك دەستی پێ کردووە .

هەر زوو ، لە تەمەنی هەژدە ساڵییەوە جیۆڤانی بۆکاشیۆ تووشی داوی خۆشەویستی بوو ، ئەویش ، وەك پێترارك لە کڵێسەیەکی شار بە تیری عەشقی ماریای زۆڵە کچی پاشای ناپۆلی گرفتار بوو(20) . ماریا لە ژیانو هونەری بۆکاشیۆدا دەوری پاتریسی دانتێو لۆرای پێترارکی بینیو ناوی لای ئەو بووە فیامێتا (Fiammetta) واتە ئاگرۆك یا پشکۆ(21). هەموو ڕۆمانە زووەکانی بۆکاشیۆ بۆ باسی خۆشەویستیی فیامێتا تەرخانکراون ، وەك ڕۆمانی فیلۆکۆلۆ کە ساڵی 1338 دەستیپێکردو دوایی تەواوی کرد . لەو بەرهەمانەیدا کە بە زمانی نەتەوەییو زاراوی تۆسکانی دایڕشتوون ، بۆکاشیۆ کۆنو نوێی تێکەڵ کردووەو گەلێك سامانی ڕۆشنبیریی ڕۆژگاری خۆیی بەر لە خۆی پاراستووەو چرای بۆ پەخشانی نوێ هەڵکردووە . ئەمەی دوایییان بۆ ئەو سەردەمەی هەموان، بە شوانو گاوانەوە ، تیا بووبوونە شاعیر بایەخی بۆ پێشخستنی ڕەوڕەوەی ئەدەب یەکجار زۆر بوو .

ساڵی 1340 ، واتە لە تەمەنی 27 ساڵیدا جیۆڤانی بۆکاشیۆ گەڕایەوە شاری فلۆرەنسە لە کاتێکدا کە هێزە پێشکەوتووەکانی دەسەڵاتیان گرتبووە دەست ، دانیشتوانی شار زۆر بەگەرمی پێشوازییان کردو وەك نیشانەی خۆشەویستیو ڕێز تاجەگوڵینەی سەرکەوتنیان نایە سەری ، فەرمانڕەوایانی فلۆرەنسەش دەرگەی کاری گەورەیان بۆ خستە سەر پشت ، بەوجۆرە ژیانێکی لەبارتر بۆ بۆکاشیۆ گونجاو دەریای بیری لە جاران زیاتر خرۆشا . لە فلۆرەنسە ڕۆمانی فیلۆکۆلۆی تەواوکردو ژمارەیەك ڕۆمانیتری دانا کە یەکێکیانی ناونا « فیامێتا »و ساڵی 1345 لە نووسینی بۆوە ، پاش پێنج ساڵ ، واتە دەوروبەری ساڵی 1350 دەستیکردە دانانی

اکلوری « دیکامیرۆن » کە سێ ساڵی ڕەبەقی پێوە خەریك بوو.
دیکامیرۆن » بۆکاشیۆی گەیاندە لووتکە .

ئەو ساڵانەی بۆکاشیۆ بــــە دانانی « دیکامیرۆن »ەوە
ریك‌بوو ڕشانەوە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای گرتبۆوە(22).
ڕەنسە یەکێك بوو لەو شارانەی ڕشانەوەی ســاڵی 1348
ی‌خستە ناو دانیشتوانیانەوە(23) . ســــەرچاوەکانی ئەو
مردمە دەڵێن لە ماوەی تەنها شەش مانگی یەکەمدا سێ دەر
جی خەڵکی فلۆرەنسە بەو دەردە مردن ، بۆکاشیۆ ژمارەی
مردوانەی بە 96 هەزار کەس داناوە ، کـــــە واپێ‌دەچێ
یتاش یەکێکیان بووبێت ، خانوبەرەو شەقامەکانی شار بە
ـەی مردوو داپۆشرابوون ، باوکێك نووسیوی‌یە چۆن بــە
ستی خۆی پێنج لە منداڵەکانی لە چاڵێکدا ناشتووە .

لەو ڕۆژە ستەمانەدا بۆکاشیۆ دەستی‌کردە دانـــــــانی
دیکامیرۆن » . گوایە حەوت کچو سێ کوڕی فلۆرەنسەیی ئەو
زانە لە یەکێك لە کلێسەکانی شار یەکتر دەبینن‌و بڕیاردەدەن
ملوەی دە ڕۆژ پێکەوە بچنە ڤیللایەکی قەراغ شار تا بەوجۆرە
می خۆیان بڕەوێنن(24) . لەوێ بۆ هەر شەوەی پاشایەك بۆ
ڕەکەیان هەڵدەبژێرن ، هەر شەوەش دەبوو هـــەر یەکەیان
ۆکێك بگێڕێتەوە کە پاشا لە ســــەرەتاوە باســــەکانی
ردەکردن . هەر لەوەشەوە بۆکاشیۆ ناوی « دیکامیرۆن »ی
چیرۆکەکانی هەڵبژارد کە لە دوو وشەی یۆنانیی کــــۆن
ماتووەو پێکەوە مانای «یادداشتی دە ڕۆژە» دەگەیێنن(25).
نووسەر « دیکامیرۆن »یان ناوناوە « هەزارو یەك شـــەوەی
رووپا » . وا پێ‌دەچێت بۆکاشیۆ کاتی خۆی چیرۆکەکانی
هەزارو یەك شەوە »ی خوێندبێتەوە کە لە ڕۆژگاری شـەڕی
چیلوانەوە کرابوونە لاتینی . بەپێی قسەی جاستۆن باری
کتێبەیدا کە ناوی ناوە « ئەدەبی فەرەنسیی ســـــــەدە
نجی‌یەکان » لە ڕێگەی بۆکاشیۆوە ژمارەیەك لە چیرۆکـــە
ڕۆژهەڵاتی‌یە باوەکان گــــــــەیشتوونەتە دەســـــــت
رووپایی‌یەکان(26) .

چیرۆکەکانی « دیکامیرۆن » کورتن ، تێکڕا یەکی شـەش
وت لاپەڕە دەبن ، هەریەکـــــەیان پێشــــەکی‌یەکی کورتی
ەڵدایەو هەموویان بە زمانێکی یەکجار پاراوو ناسكو بەهێزو
سەر بنچینەی دیالێکتی تۆســــکانی داڕێژراون‌و تـــاوەکو
ڕۆکەی ئێمەش سەرنجی خوێنەران ڕادەکێشن . بــــەلای
ڕمزایانەوە « دیکامیرۆن » دەوری لە دارشتنی زمانی ئەدەبیی
گرتووی ئیتالیدا تەنانەت لە « کۆمێدیای یەزدانی »ی دانتێو
هەمەکانی پێترارکیش زیاتر بووە . ئەوانە بەسەر یەکـەوە
گەی یەکەمن کە جیۆڤانی بۆکاشیۆ لە گێڕاوی ســـــەدەی
لردەمیندا وەرەی بەرنەداو چــــاك لـــــە ئەرکەکانی قۆناغ
تێ‌گە یشتەو بەوجۆرە ڕێگەی ڕاستی خزمەتی گەلو نیشتمانی
گرتە بەرو چووە خانەی بەرزی نەمرانەوە .

فۆلکلۆرو حەکایەتی باوی ناو خەڵکی سادەو ســــاکاری
ئیتالیاو فەرەنسەو داستان‌و ئەفسانەی ڕۆمان‌و یۆنانەکان‌و
چیرۆکە بلوە ڕۆژهەڵاتی‌یەکان ســـــەرچاوەی « دیکامیرۆن »ن .
بۆکاشیۆ زۆر هونەرمەندانە ئەو کەرەستە ڕەسەنەی تێکـــەڵ
بە باری ژیانی ئەوسای ئیتالیا کردووەو وەستایانە هەوڵی‌داوە
تیماری بیماری‌یەکانی کۆمەڵی پێ بکات . قارەمانەکـــــــانی
« دیکامیرۆن » نموونەی هەموو دەستەو چینەکانی کۆمەڵن ـــلە
پاشاو میرەوە تاوەکو بازرگان‌و قەشەو ڕەبەن‌و ئینجا خــەڵکی
سادەو ساکار ، لە کورت‌بینەوە تاوەکو دووربین ، لــــە تەپۆو
نەفامەوە تاوەکو زاناو دانا ـ .

چیرۆکەکانی « دیکامیرۆن » زۆر بەرز خۆشەویستی وەك
دیاردەیەکی ڕەوای ژیان دەنرخێنن ، ئەوەی بە هیچ جۆر لەگەڵ
سەرنجی ئەوسای کلێسەو ژیانی ڕەبەنیدا نەدەگونجا . لـــەو
قوژبنەوە جیۆڤانی بۆکاشیۆ وێنەیەکی دڵفرێنی ژیانمـــان بۆ
دەکێشێت ، بێ‌بەزەیی فەلەقەو دارکاریی ئەوکەسانە دەکات کە
مانای بەرزی خۆشەویستی دەشێوێنن .

هەمان‌کات خاوەنی « دیکامیرۆن » سەرکەوتووانە بــــە
شێوازێکی نوێ هەوڵی‌داوە لە ڕێگەی پلارو توانجی بــــەجێو
نموونەی پڕماناوە دوو پەڵە هەوری ڕەشی ئاسمانی ڕۆژگـاری
خۆی بڕەوێنێتەوە کە بووبوونە هۆی کوێرکردنەوەی گەلێـــك
ڕاستی‌و هێزی بزوێنی ژیان . یەکەمیان پێوەندی بە نرخاندنی
مرۆڤـەو دووەمیان پێوەندی بە کۆتەکانی کلێسەوە بوو .

لە « دیکامیرۆن »دا کەم لایەنی‌تری ژیان بەڕادەی نرخی
مرۆڤ سەرنجی بۆکاشیۆیان ڕاکێشاوە . لــــە زۆربــــەی
چیرۆکەکانیدا دەیەوێت تێمان‌بگەیێنێت کە نرخی مرۆڤ وا لە
خۆیدا نەك لە وەجاغو بنەچەو خێڵ‌و خێزانیدا ، بۆ پێکانی ئەو
نیشانە بەرزە جیۆڤانی بۆکاشیۆ وەك هونەرمەندێکی بەدەسەڵات
لەگەڵ خۆیدا دەتباتە ناو ناخی دەروونی قـارەمانەکانی‌یەوە ،
هەموویانت بۆ ڕووتەو قووت دەکاتەوە ، ئەمیان لــــە بـەرگی
ڕازاوەی ئاوریشم‌و ئەویان لە جلە شڕی حەوت ساڵەو ئینجا
دەیانخاتە ژێر نەشتەری یەکالا کردنەوەوە ، وات لێ دەکات پڕ
بەدڵ بە میرێکی گێل یا بە بازرگانێکی چاوبرسی پێ‌بکـەنیت‌و
بەوڕادەیەو ، بگرە زیاتریش ، ڕێزی کوڕە شـــــوانێکی زیرەك
بگریت . زۆر جار دوای پەت‌پەتێنێکی باش سەر بە پاشـــاو
میرو دەسەڵاتدارە وەجاغزادەکان شۆڕدەکات ، کـــــەڵکەڵەی
سەفەری هاتەو نەهات دەخاتە کەلەیانەوەو بە دەستی بەتـــاڵ
دەیانگێڕێتەوە ناو کۆشكو تەلارە ڕازاوەکانیان ، یا بە ئاســـانی
دەیانکاتە مەخسەرەی یەکێك لە نۆکەرە زیرەكو وریاکانیـــان .

هەموو جارێکیش تەنها ڕاستیو دلسۆزی سەردەخات ئەگەرچی لە ڕێگەی بە قوربانی کردنی جووتێك شۆخیشەوە بێت. ئەوەتا جیسمۆندی کچی تانکریدی پاشای سالێرنۆ دەکەوێتە داوی خۆشەویستیی جیسکاردۆوە کە یەکێك بوو لە پاسەوانە نەوەجاغزادەکانی باوکی ، جیسمۆندی شاکچ بە دەیان میرو ئاغاو بەگی قۆزو دەسەڵاتداری دەبینی کە هەموویان لە خوایان دەویست پێیان قایل بێت ، بەڵام کەس وەك جیسکاردۆ تەلی دلی نەهەژاند ، چونکە نەك هەر لاوێکی شۆخ بەڵکە زیرەکو وریاو خاوێنو دلپاکو دلسۆزیش بوو . کە پاشای باوکی لە ڕقانا جیسکاردۆی نەدارو نەناسراوی کوشتو لە جامێکی زێڕیندا دلی بۆی نارد ، جیسمۆند دوای ئەوەی هەر لەوجامەدا ئەو ژەهرەی ئامادەی کردبوو خواردی‌یەوەو بەرلەوەی چاوە گەشەکانی لێك بنێت ڕووی دەمی کردە پاشای باوکی‌و پێی گوت :

**باوکی بەڕێزم ! ئێمە هەموومان بەرهەمی یەك دەستو یەك کەرەستەین .. چاکەو ڕەوشت جیاکەرەوەی یەکەمی مرۆڤن یاسا با ئەوەی لەیادکردبێت ، بەڵام سروشت هەرگیز لەیادی‌ناکات ... باوکی بەڕێزم گەر بە سەنگی ڕەوشتو چاکە ئەوانەی دەوروبەرت بکێشیت دەبینیت کەسیان ناگاتە قولەپێی جیسکاردۆ ... هەژاری ، باوکی بەڕێزم، لە سامانو پارەو پوول بێ‌بەریمان دەکات، بەڵام ناتوانێت دەست بۆ ئابڕومان ببات !.**

بۆ ئاوساکەی ئەورووپا کە سەنگی تەرازووی کێشانی مرۆڤ تێیدا وەجاغو بنەچە بوو ، کە هەر ڕۆژەی نەونەمامێك لە قوژبنێکیدا دەبووە پوشووی ئاگری یەکێك لە دەسەڵاتداران، کە گەورەترین زاناو ئەدیبی « بێ‌ئەسڵو فەسڵ »ی مافی نەبوو بیر لە کچە تەپۆیەکی میرزادە بکاتەوە ، یا دەست بۆ هەندە کارو فەرمانێك بەرێت کە تەنها لایەقی خۆی بوون ، بۆچوونە وردەکانی جیۆڤانی بۆکاشیۆ دەسکەوتی گەورەو تێگەیشتنی دروستی ئەرکەکانی قوناغ بوون ، مەرجێکی بنەڕەتیی پێویست بوون بۆ ئازادکردنی مرۆڤ لە تەوقە دەسکردە ناهەموارەکانی کۆمەڵ ، دیارە بێ‌ئەوانەیش بەرەوپێش‌بردنی گەلو ڕزگارکردنی نیشتمان لە کێشە کوشندەکانی کارێکی مەحاڵ بوو .

هەر بەوجۆرە شێوازەش بۆکاشیۆ کلێسەو پیاوە چاوچنۆکەکانی لە « دیکامیرۆن »دا ڕیسوا کردووە ، بەشێك لە چیرۆکەکانی ئەو شاکارە قەشەو ڕەبەنەکانی بۆ هەڵواسیواینو ئابڕووی ڕەفتارە ناشرینەکانیانی بۆ بردووینو بیری دواکەوتوویانی بۆ خستووینەتە سەر ساجی عەلی ، خوێنەر پڕبەدڵ پێیان پێدەکەنێتو هەستدەکات چۆن ڕۆژی ئەو فێلبازانە لەسەر دەستی بۆکاشیۆو مامۆستاو هاوەڵو شاگردەکانیدا دەستی‌کردۆتە ئاوابوون ، لەو چیرۆکانەی « دیکامیرۆن »دا بۆکاشیۆ پێمان‌دەڵێت ئەوانەی دەیانەوێت ڕێگەی ڕاست نیشانی خەڵك بدەن دەبێت بەر لە هەموان بیر لە خۆیان بکەنەوە تاوەکو ببنە نموونەو قسەیان بە فیڕۆ نەڕوات ، پێی‌وایەو ڕاستیش دەکات ، کە نابێت کەس قسەی ئەو مێزەر بەسەرانە بە پوولێك بکڕێت کە بۆ خۆیان دەقاودەق دیوی ئاوەژووی فەرمایشتەکانیانن . بەشی ئەو جۆرە کەسانە لە کۆتایی چیرۆکەکانی « دیکامیرۆن »دا هەر ژێرکەوتنە چونکە لە ژیاندا دەبێت هەر چاکە سەرکەوتوو بێت ، خۆ ئەگەر بەهۆی زەبری زۆرداڵرانەوە بۆ ماوەیەك وا ڕێك‌نەکەوت ئەوا چاکەکە دەبێتە نموونەو بە نەمری دەمێنێتەوە .

« دیکامیرۆن »یش وەك « کۆمێدیای یەزدانی » یەکێکە لە شاکارە نەمرەکانی ئەدەبی جیهانی، بەڵکو تا ئیمڕۆکەش ژمارەی خوێنەری ئەویان گەلێك لە هی ئەمیان زیاترە[27] . « دیکامیرۆن » یەکەم جار ساڵی 1471 بە زمانی ئیتالیایی چاپ‌کرا ، بەڵام تائێستە صەدان‌جار بە ئیتالیایی‌و بە هەموو زمانە پێشکەوتووەکانی جیهان چاپ‌کراوەتەوە . بەدەگمەن لە ئەورووپا کتێبخانەیەکی تایبەتی هەڵدەکەوێت دانەیەك لە « دیکامیرۆن »ی تێدا نەبێت .

دەبوو بۆکاشیۆش وەك دانتێی ڕەهبەرو پێترارکی مامۆستاو هاوڕێی دروست بۆ هەموو مەبەستەکانی نەچێت ، ئەویش ، وەك ئەوان ، کوڕی ڕۆژگاری خۆی بوو ، نەیدەتوانی خۆ لە هەموو داوەکانی کۆمەڵ ڕزگار بکاتو بەوردی لە قووڵایی گشت هێزە بزوێنە نەبینراوەکانی تێ‌بگات ، لەبەرئەوە هیچ سەیر نی‌یە خەریك‌بوو بڕوای بۆکاشیۆ بە ژیان کەمێك بلەقێت ، بەر لە کۆچی دوایی بە ماوەیەك پێترارك نەبوایە لەوانەبوو دەست لە نووسینیش هەڵبگرێت .

جیۆڤانی بۆکاشیۆ دواساڵەکانی ژیانی بۆ کاری زانستی‌و نووسینی بەرهەمی مێژوویی تەرخان‌کرد . هەر لەوساڵانەشدا بوو کە دەستی دایە تۆژینەوەی بەرهەمەکانی دانتێ‌و تا کۆچی دوایی کرد فریاکەوت حەڤدە لە سروودەکانی « کۆمێدیای یەزدانی » لێك‌بداتەوەو یەکەم کتێب دەربارەی ژین‌نامەی خاوەنیان دابنێت .

ڕۆژی 21ی کانوونی یەکەمی ساڵی 1375 جیۆڤانی بۆکاشیۆ لە چێرتاڵدۆی نزیك فلۆرەنسە چاوی لێك‌ناو بووە نموونەیەکی بەرزی‌تری ئەو ئەدیبانەی چاك لە ئەرکەکانی قۆناغ

تیدەگەن و دلسۆزانە خزمەتی گەل و نیشتمان دەکەن ، ئەوانەی هەمیشە ناویان بە زیندوویی دەمێنێتەوە .

— ماویەتی —

پەراوێزەکان :

1 – پاش دوو ساڵ پێترارك لە شاری ئارێتسۆ لە دایك بوو .
2 – لەژێر فشاری پاشایانی فەرەنسەدا پاپایانی کلێسەی کاتۆلیکی ناچاربوون لە مانگی مارتی ساڵی 1309وە تاوەکو مانگی کانوونی دووەمی ساڵی 1377 بێ لە سێ ساڵی نێوان 1367و 1370 لەبریتیی ڕۆمای ئیتالیا شاری ئەڤینیۆنی فەرەنسە بکەنە مەڵبەندی خۆیان ، ئەو ساڵانە لەمێژوودا بە « دیلیی ئەڤینیۆن » یا « دیلیی بابل » ناودەبرێن .
3 - R. Weiss, The spread of Itallan Humanism, London, 1964, pp. 24 - 26.
4 - M. L. Bush. Renaissance, Reformation and the Outer World, London, 1964 pp. 151 - 152.
5 – وەك لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد ئەوسا هەموو ڕووناکبیرانی ئەورووپا لاتینییان دەزانی .
6 – مەبەست (Humanisma) ە کە لە (Humanitas) ی لاتینیو ئەویش لە (Homo) وە وەرگیراوە کە مانای مرۆڤە .
7 – ول دیورانت ، قصة الحضارة ، الجزء الاول من المجلد الخامس (18) ، ترجمة محمد بدران ، الطبعه الثانيه ، القاهرة ، 1967 ، ص 7 .
8 – ا . ا . جویبر ، فرانچێسکو پێترارك ، « مێژووی جیهان » ، بە زمانی ڕووسی ، بەرگی سێیەم ، مۆسکۆ ، 1957 ، ل 625 .
9 – بە کەمێك دەسکارییەوە وەرگێڕاوە .
10- R.S. Hoyt, Europe In the Middle Ages, London, 1957, p. 594.
11- Cola dl Rienzo.
12– دەوروبەری کۆتایی ساڵی 1354 ناحەزانی کۆلا دی ڕێنزۆ زەفەریان پێیبردو کوشتیان .
13– کورتەی ژیننامەی خۆیەتی .
14– دەربارەی سەرکەوتنی ئەسکیپۆی ئەفەریقاییە بەسەر هانیباڵی ناوداردا ، ئەو سەرکەوتنەی کاتی خۆی ڕزگاریی بۆ ئیتالیا هێنا .
15– دەربارەی ڤێرجیل بڕوانە بەشی یەکەمی ئەم وتارە .
16– مەبەست لە ئیمپراتۆریی پیرۆزی ڕۆمانی ( الامبراطورية الرومانية المقدسه ) ئەو دەوڵەتە فراوانەی سەدە ناوەنجییەکانە کە ئەڵەمانیاو بەشێك لە ئیتالیاو خاکی چیكو سویسرەو هوڵەندەو بەلجیکاو لۆکسەمبورگو چەند هەرێمێکیتری ناوەندی ئەورووپای پێکەوە بەستبوو (ساڵی 962 ئۆتۆی یەکەمی پاشای ئەڵەمانیا دایمەزراند). پاش چەند سەدەیەکی کەم ئیمپراتۆریی پیرۆزی ڕۆمانی بووە دەزگایەکی بێدەسەڵات ، هەرچەندە بەناو تاوەکو ساڵی 1806 مایەوە . لە سەردەمی ڕێنیسانسدا ڕۆژی ئیمپراتۆریی پیرۆزی ڕۆمانی تەواوبووبوو .
17- De Contemptu Mundl .
18- R. Welss, op. Clfl, p. 29.
19– تاوەکو ئێستە ڕۆژی لەدایکبوونی نەزانراوە .
20– دایکی ماریا یەکێك بوو لە دۆستەکانی پاشای ناپۆلی .
21– لە ئاگرەوە ، فیامێتا بچووككردنەوەی ناززاریی کلپەی ئاگرە .
22– ساڵی1333 نەخۆشیی ڕشانەوە سەرتاپای چینی گرتەوەو لە ڕێگەی چینەوە چەند ناوچەیەکیتری ئاسیا خراپ تووشی هاتن ، بەهۆی کێچو مشکی ناو ئەو کەشتییانەی کەلوپەلی بازرگانیی ڕۆژهەڵاتیان دەهێنایە ئەورووپا ، ئیتالیاو ژمارەیەك وڵاتیتری ئەو کیشوەرەش دەوروبەری ساڵی 1348 هەمان نەخۆشییان تیا بڵاوبۆوە .
23– بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە :

ول . دیورانت ، قصة الحضارة ، الجزء الاول من المجلد الخامس (18) 1967 ، ص 52 – 55
E. Peters, Europe. The World of the Middle Ages, New Jersey, 1977, pp. 527 - 528.

24– بۆکاشیۆ ناوی فامێتای خۆشەویستی بۆ یەکێك لەو کچانە هەڵبژاردووە .
25- Deka hemeral.
26– بڕوانە : محمد مفيد الشوباشى ، رحلة الادب العربى الى اوروبا ، القاهره ، 1968 ، ص 126 – 127 .
27– دیارە ئەوە لە پایەی بەرزی « کۆمێدیای یەزدانی » کەمناکاتەوە ، تەنها ئەوەندە هەیە تێگەیشتنی ناوەرۆکی ئەو زۆر لە « دیکامیرۆن » زەحمەتترە .

« عبد الرحمن مزوری »



# خانیێ کاریکاتێرڤان

ڕاسته مشه نڤێسه‌ڤانێد كورد ، په‌رتوك‌و ڤه‌كولین‌و گوتار لسه‌ر خانیێ مه‌زن نڤێسینه .. ژوان هێژا د.

عزالدین مسته‌فاو شاكر فتّاح‌و صادق بهاءالدین ئامێدی‌و ره‌شید فندی ... و گه‌له‌كێد دن كو هه‌میان كێم یان زاف كوژی‌یێد تاری‌یێد كووچكا وی ڕه‌وشه‌ن‌و روونكرینه .. لێ [خانی] بهزرا مه ، ده‌ریایه‌كا كویرو فره‌هه ، روژ بو روژێ ، لدیف شه‌ره‌زایی‌یا مه‌له‌ڤان‌و گه‌میڤانان پتر دوپو مه‌رجان‌و مراری .. ژێ تێنه‌ده‌ر .

ئه‌ڤ گوتاره دێ هێدی‌هێدی خو بناڤ هونه‌رێ كاریكاتێری‌یا خانی‌دا به‌رده‌ت . [كاریكاتێر Caricature] په‌یڤه‌كا بیانی‌ست وێنه‌یه‌كێ سه‌یرو ئه‌نتیكه‌یه بو تشته‌كی ، بكه‌نیڤه كێشابیت .. ئه‌و هونه‌رمه‌ندێ وێنه‌یێر وه‌سا دكێشیت دبێژنێ كاریكاتێریست [Caricaturist [1]] كو من بكوردی نڤێسی‌یه [كاریكاتێرڤان] .. وه‌رن داجاره‌كا دی [مه‌م‌و زینێ] ژسه‌ری‌ڤه شه‌كه‌ین ، ده‌م ده‌مێ نه‌وروزێ‌یه .. خه‌لكێ بازێڕێ هه‌میان ڤه‌ستا ده‌رڤه‌كری‌یه... [خانی] ڤه‌له‌مێ

. خو هه‌لدگریت‌و ڤی كه‌ڤالی [2] چێدكه‌ت : ئه‌ڤ مروڤێد هه سه‌یرن .. ! هنده‌ك دبێ خاسن فرته فرته وایه ، هنده‌ك دسه‌ركولن هشا وان ژسه‌ری فری‌یه .. هنده‌كێد دن سه‌رێ وان [هولە] ژخه‌ماو پێد وان‌ێید بوینه [كاشو] ، هێرڤه‌و وێرڤه لێپده‌ن .. ! هنده‌كا ژمه‌ستیێ ئاگه‌ه ژخونینه ، ده‌ڤ دوربنه ، دشت‌و متن ! هنده‌كاژی گه‌ریا خو به‌ردایه‌و ڤێركرینه خه‌مێد دونیایێ .. چتوڤ كه‌ڤاله‌كێ ئه‌نتیكه‌یه ..؟!

**پێ خواس هنه‌ك‌و هنه‌ك دسه‌ركول**
**كاشو ژپیان‌و سه‌ر وه‌كی هول**
**سه‌رمه‌ست هنه‌ك‌و هنه‌ك دسه‌رخوه‌ش**
**ده‌م‌به‌سته هنه‌ك‌و هنه‌ك دده‌مكه‌ش**

م . ب . رودنكو /مه‌م‌و زین/ ب: 56

[خانى] گاڤا ئێسمر پەسن و سالوخێد وێ داپین و پیرەژنا خو کریە [نوژدار] بو دەرمانکرنا دەردو نەساخیێد زینێ و ستیێ و تاجدینی و مەموی .. چەوا وێنەیێ وێ دکێشیت .. ؟! پیرەژنەك ژسەری حەتا پیا ، ڤودیك و دەرمان و توبرك و شیشەیە ..!! دبن کورتەکێ وێڤە سەرێ حیلەو جەمبازی و فروفێلان خویایە .. هندەك کتێب و متێب داینە بن پاخلا خو ، هێدی و گران و سەرخو ، برێڤە
دچیت تو دبێژی ئەڤە لوقمانێ حەکیمە ( ) :

**رابوڤە عەجوزا شوبهی لوقمان**
**سەرتا بڤەدەم دەواو دەرمان**
**ڤاروو حوڤەو نشتەرو کیس (*)**
**هەلگرتن ئەوا خەبیڤە تەلبیس**
**دانی بەغەلا خوە چەند کتێبەك (*)**
**دنوما ب حەکیمە عەجێبەك**

م . ب . رودنکو /مەمو /زین/ ب : 72

ژخو دەرگەڤانێ میری [بەکر] سەی پسی سەی بو .. رویکرێت ، دێمگورگ ، بەدچەهرە ، تو دبێژی دێوە یان کابیس ..!! شەرخازوك ، کینەدار ، هەڤرکو .. تو دبێژی [بلوڤیا]یە :

**راکرتی ژبو خوە دەرگەڤانەك**
**فەتتانی زەمانە سەی پسانەك**
................................
**نالێ وی منافقی [بەکر] بو**
**بەلکی ژبلوقیا ، بەتر بو**
**بەدچەهرە ژرەنگێ دێوو کابوس**
**بەدفعلِ و ستیزەکارو سالوس (*)**

م . ب . رودنکو / مەم و زین /ب : 96

کەڤالێ دیێ [خانى] کێشای ، کەڤالێ [مەمویە] ..! ئاگرێ بەربویە دلی ، چ ئاگر ..؟! دکێلا وییا گەهشتییە مەژی ، مەژیێ جهێ هش و سەودای ، بێ هش و بێ سەودا کرییە ..! چتوف وێنەیە هوزانڤانی گرتی .. ؟! مروڤەکێ روینشتییە ، ئاگرێ بەربویە دلی ، کوری سیلاف و تاڤگەیە ، ستوینەکا دکێل و کادێی ژێ دچیت ، تژی دەڤ و دفنا دکەت :

**ئەڤ چەندە ئەوی دگەل دلی دگوت**
**ناچارە دلی ، وە دل بوی دسوت**
**دوکەل ژحەرارەتا سوێدا**
**رابو تژی بو ، محَلێ سەودا**
**رابوڤە ژدل دوخان و یەحموم**
**رەشکر لسەری دەماغ و خەیشوم**

م . ب . رودنکو / مەم و زین /ب : 114

ئەڤ وێنەیێ دکێلێ جارەکادی تێتە دوجاربکرن دەما [مەمو] دچیتە بەر دلوڤانیا خودێ ، هندی گولاڤێ لێدەکەن ، هندی رەها دلێ وی دکێشن .. هندی سەرێ خو بسنگیڤە دنن ، هندی تێکڤەددەن ، چو روحا ژێ سەحناکەن .. ؟! دکێلەك نەبیت ژوی چرایێ ڤەمری ئەفراز دبیت ، چرایێ ڤەمری مەمویە و دکێل ژی جانێ وییە .. قەت وێنە ژڤی جوانترو زێندیتر نامێنەکرتن :

**هندی کو رەها دلی کشاندن**
**هندی کو گولاڤە ، لێ رەشاندن**
**وان سەحنەکرن دجسمی جانەك**
**[إلّا] ژسەری دچو دوخانەك**
**وی موردە چراغی نلکەهانی**
**دوکەل ژسەری دچویە بانی**

م . ب . رودنکو / مەم و زین /ب : 167

وێهە کەڤالەکێ دییە [خانى] هلاویستی .. بلبلەکێ بێ پەر ، چەنگ شکەستی ، خەت و خال ژدێمی وەریای ، دناڤ رکێدا مەلیل و دامای ، بەژنا وییا بلند مینا تاکێ داریێ ئەڤرو خوار و خویل بوی .. ئەو بلبل دیما [مەمویێ] ژارە ، هوسا ووردو هوستایانە هوزانڤانی نیکار بو کێشایە :

ئەو بلبل ئەگەر چ پڕ هەوەس بو
زیندان بەدەن ، لوی قەفەس بو
ڤێکرا وەریان لوی پەڕو باڵ
تێکدا وەشیان ژوی خەت و خاڵ
قەددا وی یا شوبهەتی صەنوبەر
خەم بو ، چەڤیا ، میثالێ عەرعەر

م . ب . رودنکو / مەم و زین /ب : 115
ئەگەر مە بڤێت ئەم کوتارا خو هێشتاتە ڤاف و پڕ سوودبکەین ،

دێ بێژین هۆزانڤان و چیرۆك نڤێسێ مەزن ئەدگار ئەلن پو

وێنەێد واسی کاریکاتێری بۆ قارەمانێد هندەك چیروکێد خو کێشاینە .. دچیروکا ( ملك الطـــاعون )دا ، دبێژیت [ دەڤی خاتوینا طاعونێ ژ گوهێ چەپێ حەتایێ ڕاستێ شەقکری بو ..

جارناگوهارکێد وێ دکەتنە دوێ چالێدا .. لەوان ژارێ گەلەك جاران نەڤیایە دەڤێ خو ڤەکەت و لێڤێد خو ژ ســــــەرك راکەت ](7) . د ئەدەبێ عەرەبیدا ، ئەم ڤی هۆنـــــەری لدەف هۆزانڤان [ ابن الرومی ] دبینین ، کو گەلەك جاران وەسا سەیر

باسی خەلکی کری یە ، مینا دبێژتە یەکێ چەلاکەو درێـــژ .. بەژنا وی ریبارەکێ درێژو خارو ڤیچە ..!! دەنگێ بایێ دفنـــا وی وەکی دەنگێ بو ریزانێ یە ..!

فَلِلقَدِّ مِنهُ طولَ نَهرٍ مُعَوَّجٍ

وللأنفِ منهُ نَفخَةُ البُوقِ فِي الكفرِ !

یان :

وَتحسبُ الغينُ فكَيهِ إذا إختَلَفا

عِندَ التنَغُم فكَيْ بغلَ طَحّانِ !(8)

لدیماهیێ دێ بێژین ئەڤێ کوتارێ دەرگەهەکێ نەقوتایێ کووچکا [خانی] قوتا ، هیڤیدارین ئاشق و زانگرێد وی ، بهایێ بدەنە ڤی لایێ هونەرێ ویێ بلندو رەحمەت لجانی بن کاڤا فەرموی :

حەرڤا کو مە گوتی نەقشێ هورە
لێ مەقصودمە عنەیا وی کورە !

ژێدەرو پەیڤێد گران :

(1) The Advanced learner's Dictionary of Current Enylish .by, A.S.Hornby und others . London ,1972 / p. 143

(2) کەڤال : تابلو ، لَوْحَة

(3) قارورە : شیشا دەرمـانی یە . حُقّـە : قودیکـا دەرمـانی یە . تـەلبیس : بەرزەکـرنا ڕاستیێ ، فێل و حیلە .

(4) لوقمان : پێغەمبەرەك بو ، خەلك بو کارو تیتالێد چاك پاڵددا ، دیـارە دەستێ نـوژدارێ هـەبـویـە ، لەوان دگـوتنێ [لُقْمان الحكَيمْ]، سورتەکێ قورئانا پیروز بناڤێ وی هاتی یە خارێ .

(5) بەغەل : پاخل ، پاشڵ .

(6) ستیزەکار : هەڤڕکـو ، شەڕبـاز . سالوس : جـەمباز ، حیلەکەر .

(7) د . عِـمَـادحـاتَـمْ / مـدْخَـل الى تـاريـخ الأداب

تونـس الأوربية / 1979 /م ب : 339

(8) العقاد ـ عبّاس مَحمُود / إبن الرومي / بيروت 1968 / م ب: 119 ، 147 .

# بێستوونی عەشق
# چەنگە زێڕنی نای نەخشێنی

بەرزان هەستیار

تەمووزی / ١٩٨١ / سلێمانی

ـ ١ ـ

پۆلە رازم زۆر سەر بڕیو ..
کۆترە شینکەی کەلێ هەواریشم فێرکرد
سینەت بکەن بەهێلانە
تا مزگێنی ئەو بەهارە بکاتە گوێم ..
کە لەناخما ئەبیە چنار
لەگەڵما ئەبیتە هاوزان
کە مردیشین وا حەز ئەکەم ..
بەهەردووکمان گۆڕێ ماچ کەین ،
نەك تەنیا بی‌و
غوربەت گیانت بسووتێنێ
دووربا .. دووربا
نەك تاریکی
شەوان دڵت داخورپێنێ ..

ـ ٢ ـ

گوێ رادێرە
سەرگوزشتەی ئەو شەوانەت بۆ باس‌بکەم ..
کە لەگیانما سەما ئەکەیت
گوێ رادێرە
ـ پاییزانێ ،
شەوگار ئەگرم بە کوڵەوەو
زکری عەشق سەرم ئەگاتە گێژەنێ
زووخاو بێتە ئۆقیانووسیش ئەیخۆمەوە

تا گیانی ژوورە بێ تۆکەم
پڕ بێ لەتۆو
لەسایەی ئەوین و زاما ..
کەزی شیعرێکم دابێنم

٣

خۆزگە نیشتیمانی دڵت ئەبووە بەهار
هەتا گوڵی ووشەکانم
ئیتر کاڵای جوانەمەرگیی نەپۆشن‌و
گیانم بۆیان نەبێتە ئارامگاو مەزار

ـ ٤ ـ

هێندە بەجەستەو مێشکم ئاشنابووی
وا خۆشم‌ویستووی
« کوڕەی شیعریشم
زولفی تۆی ئەوێ
گڕووی لێ گرتووم
بۆم نانوێ شەوێ»[1]

(١) دێڕی ناو کەوانەکە بەدەستکارییەوە لەو شیعرە فۆلکلۆرییەوە وەرگیراوە کە ئەڵێ :ـ
« کوڕەی دڵەکەی من باوەشی تۆی ئەوێ گڕووی لێگرتووم بۆم نانوێ شەوێ» .

# حەزێکی شێت

فەرەیدون عەبدول بەرزنجی
سلێمانی - حوزەیرانی - ١٩٧٩

کە جێم دێڵێ
هەموو شتێ نیشانەیە بۆ تەنیایی ..
من ئەزانم چیرۆکی ئەم حەزە شێتە
فلیمێکە بێ کۆتایی ..
بۆیە ئەبێ فرمێسک لە چاوی هەڵبەستما
شتێک بێ زۆر زۆر ئاسایی ..

• • •

ئەی ئەو کەسەی لە ناو دڵما گەورە ئەبیو
تاجی وڵاتی شیعری من لە سەر ئەکەی ..
بە عەشقی تۆ ئەسووتێم
چی لە عەشقت پیرۆز ترە ؟ ..
تۆ نازانی بە نیگای ئەو جوونە چاوەی لە ئەستێرەی
ئاسمان ئەچن
پەپوولەی گیانی مردووی من بۆ کوێ ئەبەی ؟ ..
کە نیگا ئەگۆڕینەوە
چەپکێ خەمی سەوزو شیرین گەورە ئەبێ
دەچلوەکانت دامەخە .. دایان مەخە
ئەی فێر نەبووی چۆن لە خەمی شاعیر بکەی ؟ ..

• • •

تۆ ئەی خورپەی دڵی شێتم
خۆشەویستیت خەمێکی هێجگار گەورەیەو
خۆشم ئەوێ
لە دڵما جێی نابێتەوە ..
ئەترسم دلم بتەقێ
ئەوسا حەزم هەموو دنیا ئەگرێتەوە ....
ئەوسا گڕی حەزێکی شێت
هەموو گیانم ئەسووتێنێ
ئیتر کێ شیعرت بۆ بڵێ ؟ ..
کێ بگری بۆ نیگای چاوت ؟ ..
کێ بێ خەمت لە گەڵ بەشکلو
بتوێتەوە لە گەڵ دەربڕینی ناوت ؟ ..

# ئەڤین و بەفر

فەیسەل عەبدوڵلا
- دهوك -

هۆ ئەڤینێ ..!!
هەر بهارا لهەر جهەکی ،
ئاگرێ ئەفروز ..

سەرێ چیاییت سەخت و بەفرین ،
هەلنە کەتن
من نە ڤیتن ..!!

هەر ئاخە گا دارا بەڕوی ،
لێ شن ئەبوی و ئەبیتن ..
من نە ڤیتن ..!!
هەر زڤستانە گا سالێ
لبلندی یا لکوپیت چیـا
بەفر لسەرێك ئەبیت کەڤی
لگەر مە گەرما ، هاڤینێ ژی !!

بار ب کەتن
من نە ڤیتن ..!!
ژین و مرنا من ژی ئەڤین
گەر د ڤان جهادا ئەبیتن
با وەر بکە .
من نە ڤیتن ..!!
من نەڤیتن ...!!!

# کۆپلە

### ئاڵقەی چاو

من بە ئاڵقەی چاوەکانیا هاتمە خوارێ
رژامە ناو سینەو مەمان
کە گاردی دوگمە پێی زانی
یەخەی داخست .
لە نێوانی مەمکەکانیا
نیگایەکی منیشی کوشت .

### مردنی ئەدیب

ئەدیبێ مرد ...
دراوسێکان کۆبوونەوە ،
چۆن بەرێی کەن ! ،
بۆ کام ئاسمانی هەڵبرن؟!..
دەنگێك وتی :
لە جێی خۆیدا بۆ نای کێشن ؟!
لە جێی خۆیدا بۆ نای نێژن ؟! .

### کیژ

وتم ئەی کیژە جوانەکە ...
زۆر تینوومە ،
پەرداخێکم ئاو بدەرێ
وتی بۆچی خۆ کانی نیم
لەسەر رێگەی هەموو وێلێ
هەر کامیان هات خۆی تێراو کاو
بڕوات منیش جێ بهێلێ !.

### قەتیسی

چاوم گرتە چاوەکانی ...
تیا قەتیس ما
ناچار شیعرێکم خوێندەوە لە لاوکا
فرمێسك هاتە نێو کەچ نیگای .

ئەی چاوەکەم
ستایش کە
لەگەڵ دڵۆپی تۆیش رژای

### شیعر

شیعرێکم هەڵکرد بۆ دارێ
مەلێکی جوانم بۆ بگرێ
کە دەستم برد بیهێنمەوە .
لادیوارێ
بەسەر سەرما هاتە خوارێ !

### کورد

کوردێك چوە بن دارێکی کۆنە ساڵو
لێی راکشا
دارە بوو بە خەوێکی خۆش
بەسەر هەموو لەشیا رژا
دەستی گەیشتە دامێنی مامە (کاوە)و
چوو بەگژیا
کە تۆ مێشکی ئەژدەهاکت بەدەستی
خۆت پان کردەوە
بۆ گرەوی ئەو نەورۆزەت
بۆ نەوەی خۆت نەبردەوە ؟! ..

### دوو کڵۆپ

لە «بۆدابست» ...
کیژۆڵەیەك
پڕ سەر دەستێك
رۆژنامەی نوێی بۆ فرۆشتن هەڵگرتبوو
بە ئاسۆگەی سینەیەوە
دوو کڵۆپی دەنووك ئاڵی هەڵکردبوو
ئیتر گیانم شەوارەبوو لەوێ جێماو نەهاتەوە
ئێستەیش لەبەر رووناکییان
پیت بەپیتی رۆژنامەکان ئەخواتەوە

# شیعر

■ حەسیب قەرەداخی ■

لە(دانووب)ی داوێن سەوزا
شەو ئەداتە دەستی ڕۆژو
ڕۆژیش بەخەم ئەکاتەوە

## ( س )

«س» ڕووبارێك هاتە ڕێگەی ...
هەر چەند گەڕا بووارێکی بەرچاو نەکەوت
لەم بەرەوە تاریکایی بەسەر کەلدا هاتە خوارێ
لەو بەرەوە شیرینەکەی چاوەڕێ بوو بگاتە لای
لەنێواندا ڕووبارەکە ئەی نرکان و لرفەی ئەهات .
«ئەوەی ڕێگەی بەرەو یارە تا تاریکەم نەپۆشیوە بۆ نێرینە
با خۆی هەڵکات ئەوەی پێی خستە نێرینە بوواری نوێ
دروست ئەکات» .

## خەم

ئەوەتی من پێم گرتووە خەمی خەڵکم لە کۆڵایە
کە ڕۆژ هەڵدێ تا ئێوارە هەمووی هەر لە
باوەشمایە
بۆ تاریکە چرایەکی وا هەڵ ئەکەم
لە ڕەنگی جوانی دنیایە
کەچی هەر سەیر لەوەدایە
من شاعیری میللەتێکم
سەدان ساڵە
بەری خۆری لێ ئەگیرێ و
وەکوو پێویست کەسێك بە خەمیەوە نایە

## هەوروشاخ

پارچە هەورێکی شێ و شیتاڵ
ئاڵابووە باڵای شاخێ ...
خۆی ڕاگرێ ،
کە لێم پرسی وتی کاکە
هەورێکی قورس و ئاودار بووم ..

## هاتم و چووم

بە ناو لووتکەی شاخەکاندا
تەنیمەوە .
هەرچیم پێ بوو بە دڵ بەخشیم
سەرکەوتم و وردە وردە ڕەویمەوە .

## پاشقول

چوومە شاری لنگەوقووچان
ویستم وەك خۆم تیایا بژیم
دەم و چاوێ لە بەر پێما بە زمانی
پاشقولێکی وەهای لێدام
هەردوو قاچم کەوتە حەوا
سەرم بردە لای سەریەوە ،
هەر تف مابوو لە ناو دەمما
هەموویم دا بە ڕووی ئەوا

## پرسیار

پرسیم ... شەیتان ، کەی پەیدا بووی ؟!
- لەو ڕۆژەوە (هی من) ، (هی تۆ) هاتە گۆڕێ
(هی من)ەکان بوون بە (ئێمە)
(هی تۆ)کانیش بوون بە (ئێوە)
کێ بەر کێ یەك لە نێوانە
لەم سەرەوە (ئێمە) ڕەوا
(ئێوە)ش زۆردار
لەو سەرەوە (ئێوە) ڕەوا
(ئێمە)ش زۆردار
هەر خۆم بە (من)ی مامەوە
جێگەم کەوتە لای سەرووی شار تەشتی (هی)یەکانم لایە
هەرچی ڕەواو نارەوایە
لەو ڕۆژەوە تیا سەودایە
بۆ تۆماری دوایین بڕیار
کێیە کە (من) پێشێل ئەکا
کێ ئەبێتە چلکاوی شار ؟! -

# حەوان

* حسین عارف *

[ ئەمرۆ رووی خۆشە . زەردەخەنەی لە لێو هەڵدەوەرێ . فرسەتە . لە کیس خۆتی مەدە . رەنگە تا هەفتەیەکی تر ئەم فرسەتەت بۆ هەڵنەکەوێتەوە . لەدەستی مەدە ]

**خۆی گورج کردەوە . قۆپچەی چاکەتەکەی داخست . بە نحم نحمێك قو رێگی بۆ قسەکردن ساز کرد.زۆر بەنەزاکەتەوە لێی چووە بەرەوە . لەدووری دوو ـ سێ هەنگاوەوە راوەستا، بریارەکەی دابوو ، هەنگاویشی بۆنا . بەڵام هەنگاوەکەی چەقی .**

« چۆنی پێ بڵێم ؟!. بەچی دەس پێ بکەم ؟!

هەر یەکسەر ؟! . زەحمەتە !. نابێ ! چاکتر وایە پێشەکی تۆزێ راووریوی بۆ بێنمەوە . ئا یەعنی هەندێ مۆمو بوغوردی بۆ بسووتێنم .. کەمێ گولاوی بەسەردا بپرژێنم .. سێ ـ چوار چەپك گولی پێشکەش بکەم . ئەوساش ئینجا وردەوردە داخوازییەکەمی لێ ئاشکرا بکەم . ئەوەڵجار وای نیشاندەدەم کە من هیچ داخوازییەکم نییە . ئەو هەموو قسانەشم هەر بۆ دەربڕینی رەزامەندیو خۆشحاڵی خۆمە ، هەر بۆ ئەوەیە پێیڕابگەیەنم کە من چەندە بەختەوەرو شادمانم . چەندە سەربەرزو دڵ پڕ لە ئارامم ، دوایی ئینجا دێمە سەر ئەوەی یەك ـ دوو قسەی بەمانای بۆ فڕێ بدەم ، بەڵام دەبێ نەیەڵم قسە بەماناکانم زەقو ناقۆلا بن . دەبێ زۆر ناسك بن . دەبێ لە شەکر شیرینتر بن . گەر وانەکەم ریسەکەم لێدەبێتەوە بە خوری ، خۆ دەیناسم چ ماڵیکە . شارەزای نەك شا ، بەڵکوو دەمارە هەرە وردەکانیشیم . دەزانم هەر وردە دەمارەو چ جۆرە میکرۆبێ ، چ جۆرە نەخۆشییەك کردوێتییە لانەی خۆی ، دەزانم هەر شادەمارەو بە بەچکەی چ بابەتە ئەژدیهایەك ئاوسە ، دەیزانم .. چاکی دەزانم ، بۆیە دەبێ پێش ئەوەی دەم هەڵبێنمەوە ، هەزاروبەك حساب بۆ هەر وشەیەك بکەم کە لە دەمم دەردەچێ . چی بکەم! .. کە ئەو وابێ ، ناچار دەبێ منیش وابم . چی بکەم !.. وام لە چارە نوسراوە . هەر لە ئەزەلەوە وام بە نەسیب کراوە . لە لەوحی وجودایەو من هیچم لە دەستدا نییە . پێم خۆشبوو مرۆڤێکی ئاسایی بوایە ، پێم خۆشبوو ئەو دەسپێشکەری بکردایەو بیوتایە : ئەرێ برا ... ئەرێ کابرا .. چیت لە دڵدایە دەریبڕە .. چیت گەرەکە بیڵێ . پێمخۆش بوو ئەو لە لای خۆیەوە هەرزوو قورتمی بگرتمایەو بیوتایە !

شتێك لە روخسارتدا .. لەسەرو سەکوتتدا دەخوێنمەوە . زووکە بیڵێ بزانم چییە ؟! . بەڵام چی بکەم .. وانییە .. ئەوە دوو مانگە من بەو مەسەلەیەوە دەتلێمەوە . دوو مانگە ئەم فرسەت بەو فرسەتمە لە گەڵیدا . لە هەموو فرسەتێکیشدا خۆمی لەبەر دەمدا دەکەم بە سواڵکەر .. بە نۆکەر .. سەرکز، ملکەچ ، خەمناك لەبەر دەمیدا دەوەستم . خۆم دەخەمە سەرێ کە هەر هێندەی بڵێ : چ خێرتە ؟! .. چیت دەوێ ؟!. کەچی خوا نەکا شتی وای لە دەم دەرچێ . دیارە لە دەمی دەرناچێ . چۆنی لە دەم دەردەچێ ؟! . مەگەر نەیناسم چ ماڵیکە . . مەگەر نەیناسم دەمارەکانی چییان تێدایە !. بەراست دەبێ چییان تێدابێ ؟! . بڵێم چی !.. لەوە زیاتر نییە . هەر ئەوەیە .. وردە دەمارەکان میکرۆبی جۆرەها نەخۆشی ! . شادەمارەکان بەچکەی چەندەها ئەژدیها ! . دەنا فەرموو ئەوەتا من لە دەقیقەیەك زیاتر دەبێ وەك عەبدێك لە حزووریدا راوەستاوم ، بێئەوەی هەر سەرێك هەڵبڕێو سەیریکم بکا !..

بپرسێو بڵێ : ئەری کابرا چیت دەوێ ؟! . گوایە هەست بە وجودم ناکا ؟! .. بۆچی ؟! . خۆ ئەوەش نییە بڵێی وەڵلا بە جەستە زۆر بچووکو سیسەڵەمو سەرنجی راناکێشم ! .

وەزنم نەوەدو دوو کیلۆیە . درێژایی باڵام سەدو هەشتاو سێ سەنتیمە . یەعنی هەم پانوپۆڕمو هەم درێژ ، کەچی هەستم پێناکا . کابرایەکی سەیرە ! . ئەگەر حساب بۆ سەرو هەیکەل دەکا ، ئەوە سەرو هەیکەل . ئەگەر شارەزایی لە ئیشەکەدا ، خۆ بەخوا حەوت سەد ئەوەندەی ئەوی لێدەزانم . ئەگەرەکوو دڵسۆزیو خۆماندووکردنیش ، ئەوا هێستریکمو کام بار قورسە لێمیبنێن سەری دەخەمە سەر کام شاخ کە زۆر سەختەو ناڵێم نەء .. قەتیش نەموتوە نەء ! . بەراستی کابرایەکی سەیرە !.. نازانم حساب بۆ چی دەکا ؟! .. نازانم گا بە چیدا دەناسێتەوە ؟! . نازانم چۆنی تێبگەیەنم کە من گام ! .. من ئا گام !.. منگام .!.. » .

**هێندە حیرس گرتبووی ئاگای لە خۆی برابوو ، دوا رستەی بە دەنگی بەرز وت . هەر ئانساتیش لە کەتنەکەی خۆی بەئاگا هات ، بەڵام لە پاش چی ؟! . کار لەکار ترازابوو ، بەگ سەری**

**ھەنبری بوو . دوو چاوی زەقی ئەبلەقی ئاڕاستە کردبوون . ـینەی پرسیارێکی سامناکیان دەدا بە رووی ـــدا . دڵی حوریەیەکی کرد . بە دوایدا دایە ترپەترپێکی بێئامان . لە ناو ھەنزی سنگیدا وەك مریشکی سەربراو ھەڵدەپەڕی ..**

« چیت‌کرد خواگرتوو ! .. بۆ ریش ھاتیت‌و سمێڵیشت ـیە بانی ، چی پێدەڵێیت ؟! . چۆن خۆت دەرباز دەکەیت ؟!. ـمو لە ھیچی نەبوو وەك فیشەکە شێتە دەتەقی‌یەوە . لە ھیچی ـەبوو داك‌و بابی لـــە گۆڕ دەردەھێنایت . نایناسیت ؟! .. ـێستا چی دەکەیت ؟.

جارێ وا حەپەساوە ، بڕوانە چۆن چـاوی ئەبلەق بووە جارێ ھێشتا سڕە . کارەساتەکە سڕی کردووە . بەڵام ھاکا تەقی‌یەوە ، کە تەقیشەوە دەزانیت چی دەکا ؟. دەزانیت چی لە دەم ھەڵدەوەرێ ؟! . چ دوڕو گەوھەرێك ؟!. خـۆ بـۆی بکرێ پەلاماریشت دەداو دەتدااتە بەر تەکان. بەڵام بۆی ناکرێ. باشە لەو جارەوە تەمێ‌خواردوو بوو . ئەو تۆی دایە بـــەر تەکان‌و کەچی خۆی بەپشتدا کەوت ، ئەو فیرنەگولەیەك‌و تـۆ کەتەدێویێك ، ھەر باشە . لەم رووەوە ترست نی‌یە ، دەتوانێ ھەر دەمەکەت لێبخاتە کار . با بیخا ، پێی راھاتوویت ، دوڕو گەوھەرەو ھەڵیاندەوەزێنێ ، با ھێندە ھەڵیانوەرێنێ تـــا عەرش‌و قورش پڕ دەکا ، چ دەربەسم ، تەڕتەڕ نەباشـــەت . چی لێبکەم . من دوو مانگـــە دەمەوێ بۆی باس بکـــەم . ئێستاو ئەوسا فرسەتێکی ھەر نەدامێ . لە دڵمدا بوو بـــە سەرەتان ، چی لێبکەم ، خەتای خۆیەتی ، خۆی خستمی‌یە بەر ئەم حاڵەتە ، قسە بکا ڤیوسیای لێدەکەم‌و دەیدەم بـــە

رووی‌دا ، ڤیروسیای لێدەکەم‌و لێی‌ناخۆمەوە . ھـــەرچیم لە دڵدایە بۆی ھەڵدەڕێژم ، ئینجا پێشی دەڵێم : تۆ ئادەمیزاد نیت .. تۆ جانەوەریت ، پێیدەڵێم : تۆ مارو دووپشکیت .. تۆ جاڵجاڵۆکەیت .. تۆ قالۆنچـــەی ئاودەسخانەیت .. چی دەکا .. ھا .. یەعنی چی دەکا ؟! ئەو فیرنەگولـــەیەك‌و من کەتەدێویێك . دەتوانم ھەروا دەس بەرم بیگرمـــە ناو ھەردوو مشتم‌و وەك .. چیلکەیەکی وشك پشتی لە ئەژنۆم گیربکەم‌و بیکەم بە دوو کەرتەوە . ئا ڤیروسای لێدەکەم‌و ھەر ھێندەی دەمە پیسەکەی ھەڵھێنایەوە بەو دەردەی دەبەم . خۆ من ...
ــ حـــە ... یـــوا ... ن

**ئەم ڤیژەیـــەی بەگ دەرگـــاو پەنجەرەکانی ژوورەکەی لەرزاندەوە ، ئەمیشی وەك کێچ ھەڵبلووقاندەوە ، کە بینایی بە سەر بەگدا روون بووەوە ، رووانی بەگ لێی ھـــەڵساوەتە سەرپێ ، ھەردوو چاوی بوونەتە دوو کلپەی ئاگر ، دەمی کەف دەچێنێ ، دانی بەسەر یەکدا جیرە دەکـــەن . لەشیشی وەك بینی‌ئاو دەلەرزێ ، ئەو دیمەنە ، لەشی ئەمیشی وەك بینی‌ئاو خستە لەرزین ، چاوی بەسەردا پێ ئەبلەق کردن . چـــاوە ئەبلەقەکان بینی‌یان وا لەشە لەرزیوەکەی بەگ بـــەرەوڕووی دەبزوێ . بیری کردەوە ..**

« ئاخۆ چی دەکا ؟!. نیازی چی ھەیە ؟!.. پاڵ ؟!.. تەکان؟!..بڕوا ناکەم . نایکا . جارەکەی پێشوو . ئەی چی؟!. زللە ؟! . رەنگە ، بەڵام بە ئاسانی دەستی ناگاتە ســـەرم . ئەترسم تفم لێ بکا ، ئەمەم زۆر پێ ناخۆشە . ئیمانم لە کەللەدا ناھێڵێ ، ئەو جارە وەختابوو بی‌قەومێنم . وەختابوو . بە دەس ئەم قالۆنچەی ئاودەستخانەیەوە چـــاك گیرم خواردووە . نازانم چی بکەم ؟! . چارەرەشم ، بەدبەختم . کلۆلم . چی بکەم . ئەمە چارەنووسمە . بە میراتی بۆم ماوەتەوە . خـۆ دەتوانم ئێـستا دەست بەرم وەك ئەسپێ‌یەك ھەڵی‌فلیقێنم . بەڵام بۆم ناکرێ ، ئەو بەگ‌و من مـــسکین . ئەو دەســـەڵاتدارو من بێدەسەڵات . ئەو خواو من عەبد . عەبد لە ئاستی ئیرادەی خوادا چی پێدەکرێ ! ئەو دەتوانێ بڵێ بیبەن بـــە زیندوویی بی‌نێژن .. بیبەن ریشـــەکێشی بکەن .. بیبـــەن رۆژێ پارچەیەك گۆشت لە گیانی داتاشن .. کورە دەتوانێ بڵێ بیبەن لە مەیدانێکی ناوەڕاستی شاردا رووتی بکەنەوەو تێڵایەکی ..
ــ حـــە ... یـــوا ... ن

**ڤیژە ئەمجارە پەڕەی گوێی ئەمی دەدڕاند..کە ھەمدیس لە خۆی بەئاگا ھاتەوە ، بینی بەگ لە تەنیشتی‌یەوەیەو راست دەمی ناوەتە بەر کونی گوێی ، سەرسام بوو . واقی وڕما !.**

« ئای ! .. بەگ درێژ بووە ! .. بەگ باڵای بەرز بووە !. بەگ دەستی نەدەگەیشتە سەرم زللەم لێبدا !. کەچی ئەوەتا بەگ دەمی ناوە بە گوێمەوە ! »

**ھەموو شتێکی‌تری لە بیرچووەوە . ئـــەو مەســـەلەیە سەراپای بیروھۆشی داگیرکرد . دەیویست بە پەلە نھێنی‌یەکەی تێبگا . ھەنگاوێك کشایە دواوە . ھەڵیروانی ، ســـەرەتا حەپەسا ، چاوی بەسەر دیمەنەکەدا روا ، بەگ کورسی‌یەکی ھێنابووە تەنیشتی‌یەوەو چووبووە سەری ، بەگ بەوە دەمی گەیاندبووە ئاستی گوێچکەی‌و ڤیژەکەی خۆی راســـت تێیەئاخنی . ئەم ھەموو شتێکی‌تری لە بیر چووبۆوە . لـــە دڵدا پێکەنینی بە دیمەنەکە دەھات . دەشی ووت :**

« دەك داوەشێیت بۆ خۆتوو ئەتوارت» تۆ چۆن بەگیکیت؟! . بەگ چۆن وا خۆی دەکا بە مەسخەرە ؟!. فەرموو ئێســـــتا

یەکێك بەو شێوەیە بتبینێ چی دەڵێ؟!. ناڵێ بەگ تێکچووە؟! یا هەر هیچ نەبێ ناڵێ بەگ هێندە سیسەڵەو نابووتە کە تا نەچێتە سەر کورسی‌یەا، ناتوانێ بە گوێی بەردەستەکەیدا بقیژێنێ ؟! . بەخوا برا بەگێکی قۆڕو بێنموودە . وەڵلا دەڵێی شەقێك لە کورسی‌یەکە هەڵدەمو وەك بووکەسەماکەرەیەك بەری بدەمە خوارەوە .. دەڵێی ..

ــ حە ... یوا ... ن

**بەگ لە سەر کورسی‌یەکە هاتبووە خوارەوە ، بەڵام هاتبۆوە بندەستی ، خۆی خستبووە سەر نووکی پێو بە گوێیدا دەیقیژاند ، هێشتا لەشێتی هەر وەکو بینی‌ئاو دەلەرزی ، چاوی هەر دوو کڵپەی ئاگربوون ، دەمی هەر کەفی دەچاندو دانی بەسەریەکدا جیڕ دەکردنەوە . ئەم هەنگاوێکی‌تر کشایە دواوە . ئەو بە دوایدا هات . هەنگاوێکی‌تریش‌و هەر بە دوایدا هات . بیری لێکردەوە . لە دڵی خۆیدا وتی !**

« دەترسم بیقەومێنێ و تفەکەم لێ‌بکاتەوە . ئەمجارە لێی‌ناخۆمەوە. دەس دەنێمە بینی‌و تا نەیخنکێنم بەری نادەم. جا بۆ ! .. هەروا دەست بەرز دەکەمەوەو یەك مشت دەدەم بە تەوقی سەریداو بەسەر زەوی‌یەکەدا دەیکەم بە توێژاڵێك ئاوو زولزولە !. بەڵام نایکا .. دەزانم زات ناکا تفم لێ‌بکاتەوە. جاری پێشوو روخساری خۆم وەها لێ‌گرژکرد کە بۆ حەوت پشتیم ئاقڵ کرد . ئەو کشانەوەیەی کشایە دواوە ئیتر هاتنەپێشەوە نەبوو . بگرە چووە بەرپەنجەرەکەو ئەو پشتەی تێی‌کردم ئیتر ئاوڕلێدانەوەی بۆ نەبوو ..

منیش خیسەیەکی ئاگراوی پڕ رق‌وکینەم لە پشتی کردو هەر یەکسەر سنگم دەرپەڕاندو چوومە دەرەوە . ناتوانێ تفم لێ‌بکاتەوە . نەء ناتوانێ .. زات ناکا . لەو جارەوە بۆی دەرکەوت من چەندە بە تفلێکردن قارس دەبم . چی‌تر دەکا بابیکا ، بەڵام هەر ئەمەیان نەبێ . هەر ئەمەیان ..

**ــ تفوو ... حەیوان ..**

**بەگ قەوماندی . تفەکەی لێکردەوە ، ئەم یەکەم سات لەجێی خۆی سست بوو ، دووەم سات هەستی بە تفەکەی بەگ کرد کە بە تەختی ناوچەوانیدا وەك دڵۆپە سریشێك بەرەو خوار دادەچۆڕێ . سێهەم سات گڕی ئاگرێك لە سەرو روخساریدا کڵپەی سەندو بە خێرایی بە سەراپای جەستەیدا تا کەلەموستی پێی تەشەنەی سەند .**

**لە چوارەم ساتدا گڕەکەی ناو سەراپای جەستەی کشایەوە ناو دەمی‌و پەنگی تێداخواردەوە . لە پێنجەم ساتدا لێی‌بووە تۆپەڵێك تفەو لەودیو هەردوو لێوی‌یەوە بۆ تووڕهەڵدان کەوتە سەرپێ . لە شەشەم ساتدا تووڕهەڵدرا:**

**ــ تفوو لە خۆت‌و خۆت حەیوان هەی حەیوان .**

* ■ *

# مرۆڤی ڕاستەقینە

**سلّح محەمەد ئەمین**

**کە لە ژوورێکی بچووکی نزمدا ، لەگەڵ کۆمەڵێك تێك ترنجابووین ، خۆشم نازانم چۆن تیایدا جێگامان ببووەوە ! ژوورەکە کونبڕەو هیچ پەنجەرەیەکی تیادانی‌یە ، بۆنی هەناسەو هالاوی سۆپاکەی لەچەقی ژوورەکەدا دانرابوو ، خەریکە ؛ کرێوەو ، تۆفو ، وەیشوومەو زریانی زستانە سەختەکەمان لە بیربەرێتەوە ، گلۆپێکی تەپو تۆزاوی شەوق زەردهەڵگەڕاو ، هەر وەك چاوەڕوانی مەرگمان بێ ، بە ناوەڕاستی ژوورەکەدا شۆڕ بۆتەوە بە هالاوی سۆپاکە سووکە لەرەیەکی بۆدەکا ، ڕووناکی یەکی کەمی لێ پەرش بۆتەوە ... چینەکانی سەرەوەی ناو ژوورەکە نیشتبوونە سەر یەك ، پاڵە پەستۆیەکی زۆر کەوتبووە نێوان**

گەردیلەکانی ، تادەهات زیاتر چۆکی دادەداو ژوورەکەمانی دەگرتەوە ، تائەو کاتەی نازانم بۆچی ڕاست بوومەوە هەستم بەوە نەکردبوو ، هەرکە هەستام سەرم لەشوێنێکو لەگەردنیشم بەرەو خوار لە جێگایەکی تردابوو .. گەر حاڵ وا بڕوا ئەوا هەوای پیس ژوورەکە دەگرێتەوەو دەرباز بوونیشمان مەحاڵ دەبێ . ئەو هەستانەم بووە هۆی ئەوەی بکەومە گێژاوی بیرکردنەوەیەکی سەیرەوە ، هەموو هەست و نەستی خۆم بۆ چینەکانی سەرەوەی هەوای ژوورەکە تەرخان کرد ، دوای وورد بوونەوە یەکی زۆر چاوم بە دەزوولەیەکی زۆر باریك کەوت کە گەردیلەکانی بەرەو درزێکی بچووکی دیوارەکە ڕێچکەیان بەستبوو ، هەر بەویشدا زانیم کات ڕۆژە ، دەمویست تێبگەمو بزانم کە ئەو درزە بواری دەرباز بوونی گەردیلەکان دەدا ! دەڵێن «جام کەپڕ بوو لێی دەڕژێ» ژوورەکەی ئێمەش پڕبووەو لەوە دەچێ هەمان شت بسەلمێنێ ، بەلام نەخێر ، هێشتا ماویەتی ، فراوانییەکی زۆر لە ژوورەکەدا ماوە ...

لەگەڵ دەزوولەی ئەو گەردیلانەدا ڕێم گرتە بەر ، خۆم بچووك کردەوە تابوومە یەکێك لەوان ، بەلکو بە بچووکترینیان و لەدرزەکەوە خۆم دەربازکرد . گەیشتمەوە هەمان جێی جاران ، ئەوەی ڕۆژگارێك پێکەوەی کۆکردبووینەوە ..«بە ڕانبەرت دانیشتمەوە ، هاتمەوە سەر ڕۆخی دەریای قووڵو مەنگی چاوە کەسکەکانت ، تاچاو بڕکا دوور پێما دەڕوانی ، لە قووڵایی یاندا ؛ ژیانو ، خۆشیو ، بەختیاریم بەدی دەکرد ، ڕۆژگارێکم لە دەریلکەدا دەدی کە خۆش گوزەرانی وەك بێ بنی

ئەو وابوو .. وەك شانزە ساڵ لەمەوبەر ، کە چاوت بڵند دەکردو بۆلای منەوە دەتڕوانیو سەرنجمان یەکیان گیرەبوون ، لە چاوەکانتا نوقوم دەبووم ، ئەگەر چی بتتروکاندایە یان بۆ لایەکی ترت وەرچەرخاندایە ، نەدەبووە هۆی دەرپەڕاندنم ، بەلکو لە ناو ئەو سەوزیو خۆشییەدا جێدەمام ، وام هەست دەکرد هیچ شتێك نییە بتوانێت لەو بەهەشتەم دەربپەڕێنێت ، بەلاشمەوە وابوو کە تۆش لەمانەوەم ئاگاداریتو پێخۆشحاڵی ... لەبەر چاوما وەرز بەهار بوو ، تەڵە نێرگزێکی وەك چاوەکانت گەش وەك هەموو سەرەتاکانی تری ئەو وەرزە لەیەخەت درابوو ، بەوەش هێندەی .ترمەستت دەکردم خۆم بە خاوەنت دەزانی ، لەو باوەڕەشدابووم کە تۆ لەچاوم دەگەیت ، چونکە من هەموو نیگاکانتم بە دڵی خۆم شی دەکردەوە ..«کۆکەیەکی بەتینی یەکێك ، بەپاڵە پەستۆو بەهەمان درزا خزانییەوە زنجەکە ..» شانزە ساڵی دوورو درێژ برینەکەمیان سارێژ نەکرد . باشە بۆچیو چۆنو کەی هێنراومەتە ئەم ژوورە تەنگەوە ؟

نازانم !!.. نەخێر وانییە ، چاك دەزانم هۆی چیبوو ، خۆم گێل دەکەم ! ئەوساکە ئاسایی نەبوم ، ئازا یەبوم لەو ڕۆژگارەدا ئازایەتیو بەجەرگی ئەوە بوو کە بمویرایە ڕوو بە ڕووت ببمەوەو چیم لەدڵا بوو بۆتم بدرکانایە ، کەچی نەمویرا ، بۆچی ؟ چونکە لەوە ترسام کە هەتا هەتایە لەو دەریاکەسکەی چاوەکانت بێ بەشم بکەیتو ، لەبەر چاوت ڕەزاگرانبیم ، نەم دەزانی شێوەی کارەکەم دەبێتە هۆی تاساندنی هەموو هیوایەکم ، بۆیە بە پێچەوانەی هەموو کەسێکەوە ڕاوێژکارێکی نەشارەزام هەڵبژارد ، چونکە زۆر نییە پێم نابەجەرگی خۆماو لەو ئەنجامەم پرسییەوە ،

بەرانبەرەکەم ؛ حەپەسا ، دەمی داچەقاند ، ڕەنگێکی هێناو ڕەنگێکی برد .ئەمجا بە پرسیارێك وەلامی دامەوەو ناکام گەیشتمە ئەوەی کە ، ئەوساکە هەستی تۆی بێگەردیشیان ڕووشاندوە ، بۆیە ئاواتم دەخواست کە بەر لەو کاتە بمردمایە ، بریا هەر هیچم نەکردایە ، دوای ئەو هەموو ماوە زۆرەش کە بۆیان گێڕامەوە ڕاوێژکەرەکەم چۆن هاتۆتە پێشەوەو چی وتوە ، فرمێسك لە چاوما خۆی نەگرت بە جۆرێك دەڕژا ، کە لەشەرما دەموو چاوم خستە ناو هەر دوو لەپەوە ، لەناخیشەوە دەنگی دەروون

بەرز دەبووەوەو پڕ بە ماڵەکە دیقیژاند ، «ئەمەشیان بە ناوتەوە هەڵبەستو هەستی ناسكو پاکی ئەویان پێ پووشاند ! داخۆ چەند نەفرەتی لێ کردبێ؟» چیم بەخۆم کرد؟ گەر وانەبوایە ئێستا ئەم زامە بەسوێیەم لە دڵا نە دەبوو ، بەڵکو وەك ئەو خەڵکە ئاساییە دەبووم کە پزیسکێکی بچووك ڕووناکیی هیواو ئاواتیان پێ نوێ دەکاتەوە ، بریا هەزار بریا هەر هیچم نەکردایە ، بەڵام تازە دوای چی !! بەدەستی خۆم خۆم تاساند ، مرۆڤ یەکجار دێتە دونیاوە ئەو جارەش گەر نەتوانێت خۆی کەشتیوانی خۆیبێ هەر نەبوونی چاکترە ...»

سیخورمەی یەکێکی تەنیشتم بەئاگای هێنامەوە ، گوێم شل کرد ، یەکێك لەژێر لێوەوە دەیوت :

- کرێوەو زریانی ئەم جارە لەوە ناچێ بهێڵێ جارێکیتر بەزیندوێتی سەر لەم زوورە بەرینە دەرەوە !!

هەر چەندە تەڵخیەك بەری چاوەی گرتبوو بەڵام سەرنجی خاوەن قسەکەمدا ؛ سەری داخستبوو ، دەستەو ئەژنۆ وەك بەدیار تەرمێکەوە دانیشتبێ ، ڕەنگ هەڵبزڕکاو ، لەمن خراپتربوو ... کەچی یەکێکی تر کە بەجۆری دان پیانانی قسەکانیا دیاربوو هەموو ئەو وشانەی کە دەری دەپەڕاندن لەکانگای دڵیەوە هەڵی دەهێنجان وتی :

- دەبێ دەیلن ومیشوومەی وا بەسەر بچێو سەرمان بۆ شۆڕکا ...

کە سەرنجی ئەمیانمدا هەروەك لەسەردەمێکی ئاساییدا بێ ؛ ڕووخۆش ، زەردەیەکی ناسك دەموچاوی گرتبوو ، چاوەکانی دەبریسکانەوە ، هیوای دواڕۆژێکی گەشو برِوایەکی بەتینی بەو دواڕۆژە لێ بەدی دەکرا ... کەچی ئەوانەی وەك منو خاوەنی قسەی پێشووبوون ؛ سەریان داخستبوو ، لچیان شۆڕبوو ، ڕەنگیان پەڕیبوو ، بەفوویەك دەکەوتن ، تەنانەت زمانیان وا لاڵ بووبوو بەچاكو خراپ قسەیان بۆ نەدەهات .

هیچ کەس لەسکی دایکییەوە ئەو مەلەوانییەی ناو دەریا کەسکەکە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ ، بەڵام سووربوونو خۆڕاگرتن لەبەر شەپۆلی وێڵو بەتینی دەریاکە ، هۆیەکی سەرەکین بۆ ئەو جۆرە ڕوانینە .. بۆیە منیش لەدڵی خۆمدا وتم :

**«ئەو هێشتا لەقووڵایی دەریا پیرۆزەکەی**
**خۆیدا مەلەدەکا ، خۆزگەم بەخۆی .»**

**دیسان بچووك بوومەوە زۆر زۆر بچووك ، بەجۆرێکی وا کە بەنێوان کەردیلەکاندا تیژ تێدەپەڕیم جوولەیان نەدەکرد ، هەرچەندە لەچرپیدا ئەوەندە لێك نزیك ببوونەوە کە ئەگەر من خۆم بەو جۆرە لێنەکردبایە ، لێم دەبوونە دیوارێکی کۆنکریتیو دەربازبوونم لەو درزەوە مەحاڵ دەبوو ... بۆجاری دووەم ڕووبەڕووی بوومەوە ، ئەمجارەیان ئەو بەچاو دەدوا :**

**« - جارێکی تریش بەرانبەرم هەڵتووتاندیتەوە ، خۆشم دەویستی ، بەڵام تۆ بەچاکی مانای خۆشەویستی فێرنەبوبویت بۆیە ، زوو هەناسەت سواربوو ، زوو تواناکەی سەرەتات نەما ، هەر لەدوای چەند گەردەلوولێك ، کە ئەمانەی خۆیان بەدەم دەریای خۆشەویستییەوە دەدەن زۆر ئاسایین ، کەچی تۆماندوو بویت کەوتیتە دڵەکوتەو ڕاڕایی وابیرت دەکردەوە کە ژیان ماوەیەکەو ئەوە ناهێنێ هەمووی لەپێناوی مندا بەفیڕۆ بدەیت ، بۆیە تارەهات پەل هاویشتەکانت لەتوانا دەکەوتن ، پاش گەزبوونەوەش زیاتر لەدەرووندا تەشەنەی دەکردو بیرو هۆشی دادەگرتیتەوە ، لاتوابوو هەر کەبەزیتو کشایتەوە ، ئیتر بەهێجگاری منت**

**بیـردەچێتەوە !! کـەچی وانـەبـوو ئـەوەتـا پـەنجـەی پەشیمانی دەگەزیت . تازە دوای چی ؟ بەلام نەء، ژیان خۆی لە خۆیدا تاقیکردنەوەیە. تەنیـا باش ئەزانە کـە قوولایی دەریا زۆر زۆر بەجێترو پڕ هیواترە لە ناڕەکەی ...**

**هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو ئۆفیکی پـڕ لەسوێی یەکێکیان خزانیـەوە ژوورە تەنگـەکە ، بـەلام ئـەمجـارەیـان هـەمـوو شت بـەلامـەوە ئاسایی بـوو ، ئەو زنجـەم ئێبووە ؛ خـۆشترین و چـاکترین و ، لەبـارترین جێگـا ، ڕەنگیشم سوورایی تێزایەوەو زمانم کەوتەوە گۆو بوومەوە بـەمرۆڤـە ڕاستەقینەکە .**

**سلێمانی**

**٣٠ ـ ١٢ ـ ١٩٨١**

* ▪ *

---

# گۆڕبە

**سۆران مەحوی**

ئەو ئێوارە زوو دووکانەکەت هەلگرت . لەترسی باو و بۆرانەکە ، خێرا بۆت تێ توچاند .. کاتێ گەیشتیتە مالەوە ، سەربانەکە بەتەواوی بەفر گرتبووی .

نەخێر وەختی ئەوەی هات بوو . بانەکە بمالرێت و تۆش لە هەموو مالەکەیا . زیاتر خەمی ژووری نووستنەکەت بوو. ها ئێستا یان تاوێکی کە . دلۆپە دا بکات و هەموو لایەک هەراسان بێت.

ئا ... بەلێ . زۆرت بۆ هات و سەرت کێشایە ژوورەکەوە ،

کەمێ بەناو ژوورو دارەڕاکەیا ڕوانیت . بۆ شوێنی دلۆپەیـــە دەگەڕایت تا بکەویتە سەربان و شوێنەکەی بکوتیتەوە .

لەو خەیالەدا بوویت بینیت . لەبن میچی دارە ڕاکەوە . تارماییەک دەجوولێتەوە .. خۆتت بۆ نەگیراو لە تارماییەکە چوویتە پێشەوە .

نەختێک هەستت لێ ڕاگرت . ڕوانیت وا ڕەوە مشکێک لە نێوان درزی دارە ڕاکانەوە زرتەی چاویان دێ و ملــە قووتێی هاتنە خوارەوەیانە .

ئەو دیمەنە ترسی داکرتنی دلۆپەکەی لـەیاد بردیتەوە . ناچار بانگی گولەخانی خێزانت کرد :ـ

ـ ئافرەت خێرا وەرە !!. بنوارە مشك باریوە .. ئای سەیرکە چۆن وورووژاون !!

کاتێ ڕەوە مشکەکەی بینیی واقی وورماو تەنانەت بـۆ پشت گیری کردنی تۆشوا وەلامی دایتەوە :ـ

+ وا بڕۆین مشک هەلمان دەگرێ !!. پیاوەکە وا دیارە ژەم بووردەو برسیانە ؟!.

هەرچۆنێك بوو . تەلەکانی بەفریا خستیت .. دەست بەجێ ناتنەوە ، ئیتر نەتزانی چۆن بۆنیان کردو بۆلێســـەو خواردنی گرد بوونەوە ..

سەرەتا هەموو بەدەووری تەلەکاندا دەهاتن و دەچوون .. تا ( نان )ە . چەورەکە زیاتر نیزیکی دەکردنەوەو ســەری بەهەندێکیان کێشایە چاوی تەلەکانەوە .

ئەوەندەی نەبرد . تەلە دارەکەیان تـــەقی و دوومشکی قۆزتەوە . بەو گرتنە مشکەکانی کە تۆقین و کەمێ رەوینەوە.. نەخێر ئەمجارەیان نانەکەت زیاتر چەور کرد . تا ئەوە بوو . نانە چەورەکە بۆنی سەرداری بێسەر دەکرد .. بۆنەکـــە مشکەکانی یەك بەدوای یەکدا ، بەکێش کردەوە ... ئـەوەی جیاوازی لەڕەوە مشکەکانی پێشوو هەبوو . ئەوە بوو جرجە کلك درێژە چاو زیتەکە پێشڕەویان بوو :ـ

ـــ **مەگەر ...**

+ **چی ؟!.**

ـــ **تەلە تەلەکە لەعۆبەی بێت .. ئەوە پێویستە**

+ **چۆن؟!**

+ **بەزیندوێتی بگیرێ و بە بەر چاوی مشکەکانەوە ئازار بچێژێت !**

**+ وەك دەڵێی : ـ سەیری خاوەن تەڵەکە !**

**مشکێك چووە پێشەوە ، ئەوەندەی هەڵپەکرد ، سەری خۆی دانا .. دووبارە مشکەکان چوون .. بەڵام جرجەکە هیچ دەربەست نەبوو ، زیاتر لەتەڵەکان نیزیك دەکەوتەوە ..**

چەشنی زمانزان . چاوی تەڵەکانی . بەکلکە درێژەکەی ، گشت تەقاندەوە ... تۆشی عەزرەتی ئەوە بوویت .. توخنی تەڵە تەڵەکە کەوێتو بەهەقی خۆی بکات .

نەخێر چووە سەر تەڵە تەڵەکە ، هەندێ لەنانەچەورەکەی قرتاند .. بەو ژەمە هیچ لەبرسێتی نەشکا .. « دەزانم .. زۆر باش دەزانم ، مردنم حەتمیە !! بەڵام چیبکەم ئەمەش غەریزەی ژیانە و ژین هەردەم بەم پێوانەیە ڕۆیشتووە » .

دەمی لە نانە چەورەکە گیر کردەوەو دەستی بەقرتاندنی کرد .. هەر چەندی دەکرد لەزەتی لەبن زمانی دەرنەدەچوو .. داخەکەم نەگەیشتە ئەوەی نانەکە قتبڕ بکات . تەڵەکە زرمەی لێ هەستاو ئەویش تەقییەوە .

لەپێش هەموانەوە ، گوڵەخانی خێزانت بەدەنگەکەوە چوو :ـ

ئۆخەی ئەوە گیرایت ... زیانت گەلێ داوە ..
پاش تۆزێ وەستاندن : ـ
با خاوەن تەڵە بێت .. ئەوسا دەبینیت .

بیرت لەوە دەکردەوە ، چۆن تۆڵەی بەرەو دوای لێبکەیتەوە .. چونکە دارو بەردی ماڵەکەتانی بەسەریەکدا دا بێژا بوو .. تەنانەت هۆی ئەو هەموو دلۆپەیەش هەر ئەو بوو .. هێشتا نەگەیشتبوویتە بڕیارێ ، ئەوە بوو گۆرانی کوڕت کە سەربانەکەی دەسڕیەوە ، دالغەکەی پێبچڕیت و هاواری لێکردن :ـ

**هۆ بابە !!. هۆ دایە !!. وەرن بڕوانە باڵندەکان ، بەدەنگێکی بەرزتر :ـ**

**بزانن بەم نیوە شەوە ، ئەو باڵندانە چۆن بەیەکدا دێنو دەچن .**

**لەوەدا بوویت ، وەڵامی بدەیتەوە کەچی شیلانی کچت وەك دەڵێن :ـ قسە لەشێت یان لە مناڵ وەڵامی دایتەوە:ـ**

**لەترسی ڕاوکەرەکان ... لەترسی سەرما هەڵاتوون . پاش تۆزێکی کە :ـ**

**ئێستاش بۆ شوێنێکی هێدیو بەئارام دەگەڕێن ... هیچ نەبێ تۆزێ بحەوێنەوە .**

ووتەکانی شیلان ووری کردیو بیرتی بۆ زۆر شت دەبردیتەوە .. دواشت خەیاڵی هێنیاتە لای تەڵەکە ... (ئاخۆ ئێستا حاڵی جرجەکە چۆن بێ؟! ) ...

کەچی لەپڕ گوڵەخان بەئاگای هێنایتەوە ...

پیاوەکە خت فسکە ، گووربە چاو شینە موو زەردەکە ، تەڵەو جرجەکەی فڕاند ...
بۆ کوێ ؟!
بۆ بەرەوە ...

کاتێ ئاورت دایەوە ، نە تەڵە ماوەو نەجرجەکە ... قەدەرێ دوش دامایت .. لە دڵەوە دەتووت :ـ (ئەمەش دیمەنێکی کەی ژیانەو غەریزەیەکی تری ئەم ژینەیە ) .

ئیتر پاشان ئێوەش ، لەگەڵ خامۆشیو بارینی کڵۆ بەفرە سپیو پاکو بێگەردەکاندا ... هەموو بێدەنگیتان لێ کردو ئەوانیش هەموو چوون بەپێسوو کاری خۆیانەوە .

# ئاهەنگی کردنەوەی کارگە

**نووسینی : عزیز نسین**

**وەرگێرانی : سعید یحیی خطاط**

ئۆتۆمبێلی تازەبابەتو نوێ مودێلو پانو بەرین یەك بەدوای یەك لەبەر دەرگای کارگە دەوەستانو خانمو پیاوی ماقووڵو بەپۆزی لێدادەبەزینو دەچوونە ژوورەوە . چوار پێنج زەلامی ورگنیش وەستابوونو بەخێرهاتنی میوانیان دەکرد :

- فەرموون قوربان .. بەخێر بێن
- پێوەندی ئێمە لەگەڵ ڕۆژنامەکان زۆر بەتینە .. بەڵام ..
- تکایە بفەرموون .. دووای نەختێکی دیکە جەنابی وەزیر تەشریف دێنێو کارگە دەکاتەوە ..

**میوانەکان وەك سەربازێنو چاوەڕێی فەرمانی هێرش بکەن ، هەرکە فەرموویان لێکرا ، لێشاویان بردە سەر مێزی پڕ لە میوەو نوقڵو شیرینی . لە قوژبنو پەناو سووچ ، دەستەی دوو قۆڵیو سێ قۆڵیان پێك هێنا .. ئیدی شیرینی دەخوراو قسە دەستی پێکرد :**

**یەکەم ـ وەك تۆم لە جێگایەك بینیبێ ..**

**دووەم ــ بەخوا تۆش لام غەریب نی ! ها .. ها .. بیرم کەوتەوە .. وابزانم لە ئاهەنگی کردنەوەی قەسابخانە تازەکە بوو .**

**یەکەم ــ** بەداخەوە ، بەشداری ئەو ئاهەنگە نەبووم .

**دووەم ــ** بۆ ؟

**یەکەم ــ** کە دوو سێ ئاهەنگ لە ڕۆژێکیدا بگێڕدرێ .. پیاو ناتوانێ لە هەموویاندا بەشداری بکات بەندە ئەو ڕۆژە لە ئاهەنگی کارگەی بلورسازیو شووشە بووم .

**دووەم ــ** ئای بەداخەوە نەهاتی .. نازانی چ خزمەتێکیان کردین ؟

**یەکەم ــ** بیستم ... گوتیان خواردەمەنی پوختەو زەریفیان پێشکەش کرد .

**دووەم ــ** مەپرسە .. پە .. پە .. ماسی بەتامو بۆ .. قەلی چەورو لاقە مریشکی برژاو ..

**یەکەم ــ** بەسە بەس .. دەوم ئاوی کرد ..

**دووەم ــ** ئێستا زانیم تۆم لەکوێ دیوە ! لە ئاهەنگی کەشتی خستنە نێو دەریاوە .. وانیە ؟

**یەکەم ــ** ڕاست دەکەی . بەڵێ .. بەڵێ .. تۆ ئەو ڕۆژە تەنیا کێکو نیڤشکت دەخوارد .

**دووەم ــ** بەڵێ .. پزیشك گۆشت خواردنی لێ قەدەغە کردبووم .

لە قوژبنێکی دیکەی ساڵۆونی کارگە سێ کەسی تر وایان دەگوت :

**یەکەم ــ** ئەرێ ئەم کارگەیەی ئێستا دەیکەنەوە هی چیە ؟

**دووەم ــ** خوا پێئاگادارە نایزانم !

**سێیەم ــ** چکارێکتان بەم نەزمەیە ، ئەم کێکە بخۆن زۆر بەتامە .

**یەکەم ــ** نۆشی گیانت بێ .. جێگام نەما تێی بکەم !

**دووەم ــ** حەیف .. وەزعی منیش تەواو نیە .

**سێیەم ــ** تورشاتی مەعیدە بەدبەختی‌یە .. ئەوەی دەیبینی موبتەلایەتی ! گەزۆم لایە دەفەرموون ؟

**یەکەم ــ** ئا نەختێکم بدەرێ

**دووەم ــ** نەختێکیش بدەرە من

**یەکەم ــ** بەخوا خۆش بوو !

**سێیەم ــ** ئێستاکێ بەمەیلی خۆت لەوزینە بخۆ ..

**دووەم ــ** منیش ئامادەم لەم کێکە بخۆم !

دوو میوانی دیکەش ، وەك لە ساڵانی گرانی گەڕابنەوە ... پشتیان لە خەڵکەکە کردبووو دەیان گوت :

— بەڕاست .. لەبیرتە کە منداڵ بووین ؟ ئێواران دەچووینە تەکیە ؟

— بەڵێ .. بەڵێ .. چاکم لەبیرە .. دووشەموان لە تەکیەی « ئەسکودار »و سێشەموان لە تەکیەی « قاسم باشی »و ڕۆژانی هەینیش مەجلیسی دەرویشان لە « مەولانا قاپی » .

— پە لەو شۆربایەی دەیاندا !

— ئەرێ چیتر دەخۆی ؟

— هەندێ لەو پاقلاوەیە بێنی خراونیە

— خواردنی ئێوارەش هەیە ها !

— کەواتە نایخۆم

— پێم نالێی ئەمە کارگەی چیە ؟!

— لەوانەیە کارگەی ئەتۆم بێ

— چاکت زانی .. ئافەرین

⁕ ▪ ⁕

یەکێك نەڕاندی :

— ئەوە بۆ دەست پێناکەن ؟

— چاوەڕێی جەنابی وەزیرین .

کابرایەکی دیکە قسەکانیانی بڕی :

— ئاخر ئاهەنگێکی دیکەشمان لە پێشە !

لەپڕ چەقۆو چەنگاڵ لە کارکەوتن . هەموو ئاوڕیان لە کابرا دایەوە .

یەکێك بەدەنگێکی بەرز گوتی :

— باسی ئاهەنگتان کرد .. پێمان نالێی لەکوێیە ؟

هێشتا وەڵامی نەدابۆوە ، دەنگێ هات :

— وس بن .. جەنابی وەزیر تەشریفی هێنا .

لە نەفەسی تەنگی ، دیار بووومزیر لە ئاهەنگێکی دیکە دێتەوە .. بەپەلە خۆی کوتایە ژوورو یەکسەر لەپشت مێز وەستاو گوتی :

« هاونیشتمانیانی خۆشەویست ... مایەی شانازیو سەربڵندی‌یە لەم شارەدا کارگەی « بیرە » بکەینەوە .. ئەم کارخانەیە موڵکی برایانی « تزگخ تەرەقە»و بەبێ هیچ جۆرە قەرزی دەرەوە دروستکراوە . هەموو کەرەستەکانی بەقیستی بیست ساڵە لە کۆمپانیەیەکی ئەمریکایی کراونو تەنیا سێ پسپۆری ئەمریکاییو دوو ئەندازیاری ئەڵمانیو چوار مامۆستای

فەرەنسی ماوەی پێنج ساڵ یارمەتیان داوین . کارو بارەکانی دیکەش خۆمان ئەنجامان داون . هەوەڵ بڕیاربوو بکرێتــــە کارگەی ( شەراب ) ، بەڵام چونکە جۆ لە وولاتی ئێمـــەدا زۆر زۆر هەرزانە کردمانە کارگەی بیرە . ئەلبەت دامەزراندنی ئــەم کارگەیە ئاسان نەبوو .. لە کاتێکدا کە تەولوی کەرەستەکانمان دامەزراند زانیمان هەڵەی تێداکراوە ناچار دووبارە کەرەستەی نوێ بەرادان بدەین‌و هەرچەندەی ئەو هەڵەیە بەگران وەستــا ، بەڵام لائەقەلا بووینە خاوەن کارخانەیەکی مۆدێل نوێی(بیرە)، کارخانەیەکی ئەوەتۆ نەك لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ، بگرە لــــە « بەلکان »یش هاوتای نیە » .

« بوم » ..

لەناکاو تەقینەوەیەکی یەجگار توند لەبانی ساڵۆندا دەنگی دایەوەو تۆزو خۆلی پەرت‌و بڵاوکردەوە . ئیدی هــــەر بابایەو بەرەو دەرگای کارگە تێی تەقاند :

— یا ئەللا ..
— یا پێغەمبەر
— خوایە بمان پارێزی
— خوایە نەجاتمان بدەی

پاشان زاندرا ، کە بەلێ مەنجەلی هەڵمی کارگە بــەهۆی کەموکورتی تەقیەوەو دە پازدە کەسیشی شەل‌و کوێر کرد .

باقی میوانانیش ئۆخەیان کردو بەدووای ئەو کەســــە دەگەڕان کە دەیگوت « ئاهەنگێکی دیکەشمان لە پێشە » بۆ ئەوەی ناوونیشانی وەربگرن‌و لە جێبەجێ کردنی ئەرکی نیشتمانیی سەرشانیان دووا نەکەن .

---

## دوو چیرۆکی منداڵان

**عەزیزی مەلای رەش**

## گورزگورزانێ

زاناو رۆستەم‌و بەنگین‌و کاوە بۆ یــاری گورز گورزانێ چوونە ناو قانە تۆلکەکەی بەرماڵان . هەر یەکەیان گورزێکی لە تۆلکە دروست کرد . سنگێکیــان چەقــاندو پەتێکیــان تێخست .

زاناو رۆستەم‌و بەنگین زۆر لەکاوە باخۆش‌تر بوون . لە ژێرەوە لێی بەفێڵ بوون . لە ڕووالەتا بەهەڵاوتیکەی تەڕو ووشکانێ کاوەیان تێکەواند . بەڵام لەڕاستیدا بە فرت‌و فێڵ بوو .

کاوە کە تێکەوت چووە سەر شارەکە، لەتەك سنگەکە راوەستاو پەتەکەی بەدەستەوە گرت .

زاناو رۆستەم‌و بەنگین بەگورزان وەری گەڕانێ .

کاوە چ جاری ئەم یارییەی نەکردبوو . دەستوورەکەی نەدەزانی، تاکو هەوڵ بدات خۆی لە چنگیان رزگار بکات . بەڵکو رەق راوەســـتابوو . ســـەری خۆی شۆر کردبووەوە . ئەوانیش بە گورزان تا ماندووبوون هەر لێیــانـدا . ئەوجا وازیان لێهێنا .

رۆژی دووەم کەهاتنەوە هەرسێکیان گوتیان :ـ

ئەمرۆش هــەر نۆرەی کاوەیە بچێتــە سەرشار چونکە دوێنێ کەسی بێ نەخرچا . ئەوجارەش هەتا شل‌و کوت بوو هەر لێیاندا .

کاوە بەجارێ شپرزە بووبوو . هەموو ئەندامی لەشی دەی تریواند . ئێوارێ لە تــاو ژان خەوی لێ نەکــەوت . ئەوکاتە ڕووی لە دایکی کردو گوتی :ـ

ـ ئەرێ دایە ..؟ بۆ من لەیاری گورز گورزانێ نـــازانم کەس بخرچێنم . دایکی گوتی :ـ چۆن ...؟

ئەویش هەر لـــە ســـەری هەتـــا بنی سەربردەکەی بۆ گێڕاوە . دایکی گوتی :ـ گوێم بۆ بگرە ڕۆڵە .

ـ فەرموو دایە گیان .

ـ کەسبەینێ چوویـــەوە سەر قزگەکە، هەر چاوێکت بکە بە چوار چاو . نـــەکەی بەهیچ جۆرێك لەکاتی گورزت لێ دەدەن چـــاو بنـــووقێنیت . بڕوانە کامـــەیـــان بـــەگورز هەڵشـــەقـــاندن زۆرتـــر لێت دێتـــە پێش، لەهیکەوە خۆتی بگەیەنێ، بیدە بەر شاپان . ئیتر کە شاپێکیت لێیدا ئەو تێدەکەوێت ، تۆش قوتار دەبی .

کاوە ئـــەوکات لە گەمەکـــە گەیشت‌و بۆی دەرکەوت : ( هاورێ‌دنی لێی بەفێلن ) . لەدلێ خویدا گوتی : ـ

ـ دەردی منتـــان لەگیانی، با ئاواتـــان لەمن کردبێت، هەتاکو سبەینێ . رۆژی سێیەم کاوە بێ پێگوتن چووە سەر قزگەکە راوەستاو پەتەکەی بەدەستەوە گرت . بەڵام ئەوەندە تووڕە بوو، پتت لێی بدابـــایە دەتـــەقی . وەك نـــەسپێکی سەرکێش‌و خورت هەر پێکۆلی دەکرد . زاناو رۆستەم‌و بەنگینیش هەرسێکیان خۆیان ئامادە کرد .

زانا لەپێشەوە گورزەکەی هەڵشەقاند وەکو جاران بێباك لێی چووە پێش . لای وابوو : «هەر ئەو هەوارو ئەو بەهارە ». کاوەش لەپڕێك بە پڕتاوی غاری دایەو هەتا توانای هەبوو، شاپێکی لە نێو گەلانی هەڵدا، لەسەرڕا بەری داوە . زانا تاماوەیەك پێتاساو بۆی نەکرا قیت ببێتەوە . ئیتر کاوە بەم جۆرە خۆی رزگار کرد .

زانا چووە سەر شارەکەو رۆستەم و بەنگین ڕەخاوەتیان پێ دەکرد . باشیان لێنەدەدا . چونکە گەمەکەیان هەر بۆ لێدانی کاوە دامەزراندبوو . بەڵام کاوە هەر چەند گورزی لێی دەدا ڕاویە ئاوێکی پێ هەڵدەگرت . تەنگەی پێ قوول دەکرد . زانا رۆستەمی بەزاند . کاوە رۆستەمی بەدەردی زانا برد کفتایی دڵی خۆی لەم دووانە دامرکاند . پاش ماوەیەك بەنگین تێ کەوت . بەنگین زۆر لەوان هەراشتر بوو پێی شوورەیی بوو ، بچێتە سەر شارەکەو ئەم منداڵانە بە گورزان لێی بدەن . بۆیە گوتی : ــ

ــ من چیدیکە یاری ناکەم .

ئەوانیش دەسەڵاتی ئەمیان نەبوو . بەتایبەتی زاناو رۆستەم زۆریان پێ خۆشبوو . دەست بەجێ پەرتەیان کرد . کاوە ئەوکات ڕووی تێ کردو گوتی :ــ

ــ هەی فێڵبازینە، چونکە من لەناوتان نەشارەزا بووم، یاریەکەم نە دەزانی، ئێوەش لە ژێرەوە بەفرت و فێڵ و تەڵەکەبازی کلکتان کردبووە یەك بۆ لێدانی من بەهیچ جۆرێك دەستووری یاریەکەتان بۆ نەدرکاندم . تاکو لە یەکەم رۆژدا خۆم دەرباز بکردبایە . سەرێ دوو ڕۆژان بە گورزان لێتان دام چ باس نەبوو . کەچی ئێوە بەس ئەمڕۆکە تێکەوتوون، ئەویش وا وازتان لە یاریەکە هێنا . دیارە ئێوە شتێکن و من شتێکی ترم . من تا ئێستا ئەنگۆم بەبرا گەورەی خۆم دانابوون . بەڵام لەم یاریە بۆم دەرکەوت : «هەر دۆستیش نین ». مەرجە لە مەودوا تا ئێوە ئاوا بەفرت و فێڵبن منیش تخوونتان نەکەوم و یاریتان لەگەڵ نەکەم .

# ڕەشەبا لە هەموو شوێنێك داهەیە

دوو قاژقاژە لە دەربەندی بازیان دەژیان . هەموو جارێ لە دوای ماندووبوونێکی زۆر تا هێلانەیەکیان دروست دەکرد .هەرکە دەستیان لێ بەردەبوو، ڕەشەبایەك لە دەربەندەکە پەیدا دەبوو . هێلانەکەی لەبن و بۆتکەوە هەڵدەتەکاند . ئاثاری لەسەر پاثاری نەدەهێشت .

جارێك نەبوو ، دووان نەبوو، سێیان نەبوو . تاکو ڕۆژێك قاژقاژەکان کەوتنە بیرکردنەوەو مشوور خواردن بڕیاریاندا کە دەربەندی بازیان بەجێ بێلن . بچن بۆ شوێنێك ڕەشەبای لێ نەبێت . زۆریان لە دڵ گرانبوو ، کە نیشتمانی بابەلبابیان بەجێ بێلن . بەڵام چارەشیان نەبوو . بۆیە هەردووکیان بەکزی لە سەرتاشە بەردێك هەڵنیشتبوون . گوڕگوڕ فرمێسکیان دەڕشت .

لەم کاتەدا کۆترە باریکەیەك بەلایاندا ڕەت بوو گوتی : ــ

قاژقاژە خۆشەویستەکان ئەمڕۆکە ئێوەم ناگزوور دێنە بەرچاو . دەڵێی تەپە سوڕیەکتان بەسەر هاتووە ... مەسەلە چیە ...؟

قاژقاژەکانیش هەر لەسەری هەتا بنی سەر بردەیان بۆ کۆترەکە گێڕاوە .

کۆترەکە گوتی :ــ لەسەر ئەو گۆی زەویە هیچ شوێنێك نیە کە ڕەشەبای لێ نەبێت . بۆ هەر لایەك بچن هەر وەکو ئێرەیە . بۆیە پێویست ناکات ئێوە لەبەر ڕەشەبا نیشتمانی باب و باپیرتان بەجێ بێلن . قاژقاژەکان گوتیان :ــ: ئەی چارە ..؟

**کۆترەکە گوتی :**

ــ پێم ناڵێن :ــ ئێوە هەموو جارێ هێلانە لە کوێندەر دروست دەکەن ..؟

قاژقاژەکان گوتیان :ــ لەسەر لقی داری بەرز .

کۆترەکە گوتی :ــ

ــ من شوێنێکتان پێ دەڵێم کە هەرگیز ڕەشەبا کار نەکاتە سەر هێلانەکەتان . قاژقاژەکان بەسەر سوڕمانەوە گوتیان :ــ

ــ ئەگەر تۆ ئەمەمان لەگەڵ بکەیت ، ئێمە تامردن لەژێر باری چاکەت دەرناچین .

کۆترەکە گوتی :ــ

ــ بڕۆن لە دەرەزە شاخان، یا کونە کەنداڵان هێلانە دروست بکەن . قاژقاژەکان کە ئەمەیان بیست لەخەنی خۆشیان شاگەشکە بوون و زۆر سوپاسی کۆترەکەیان کرد .

لەو ڕۆژەوە قاژقاژەکان فێربوون لە دەرەزە شاخان و کونە کەنداڵان هێلانە دروست بکەن .

# ڕەنگدانەوەی گۆرانی و ئاواز لە ژیانی کوردەواریدا

● ئازاد دلزار ●

مروڤ هەر لەسەرەتای پەیدابوونیەوە ئاشنایەتی لەگەڵ مۆزیقەدا پەیداکردوە . گڤەی باو تافەتاڤی روبارو گرمەی هەورو ترپەی باران سرنجیان بۆلای خۆی ڕاکێشاوە . لەسەرەتادا لەبەردو دارو پێستەو ئێسقان چەند ئامێرێکی ( ئیقاعی ) سەرەتایی پێکەوەنا . لە دواییدا هەستی ڕاگرت کە چۆن با نەیژەکان دەلەرێنێتەوەو دەنگێکی خۆشیان لێوەدێ فێربوو کە لە زەل و قامیش لولك و پیك و باڵەبان دروست بکا . دەستی کرد بە لاسایی کردنەوەی سروشت ، بە تایبەتی بەهۆی لاسایی کردنەوەی هەندێ باڵدارو گیانەوەران توانی زیاتر لێیان نزیك بکەوێتەوەو ڕاویان بکا یاخود دەستەمۆیان بکا . هەروەك ئێستاش لە کوردەواری خۆماندا ڕاوە سوێسکە هەر بەم جۆرە دەکرێ ، شوانکارەکانمان لە ڕۆژگاری ئەمرۆشدا بە ( فیکەفیك و پیرە پیر )ێکی تایبەتی پەزەکانیان دەنگ دەدەن ، کاتێ کە بەختەو گوێدرێژەکانیش ئاو دەدەن فیکەی بۆ دەکێشن کە بە نەشئەوە بین بە ئاوەکەوە دەنێن و ورگی لێ تژی دەکەن ، خۆسەگەو پەلەوەری ماڵی و پشیلەو زۆرشتی تر هەر بە فیکەو جۆرە لێوجولانێکی تایبەتی بانگ دەکرێن کە هەر یەکە لەهی ئەویتر جیایە . جوتیار بەجۆرە دەنگێکی تر گایەکانی لێدەخوڕێ . کار گەیشتە ڕادەیەك کە لە هەندێ شوێندا ماری ژاراویان عاملاندو بە مۆزیقە خستیانە سەماو دەستەمۆیان کرد ، هەروەك لە پەندی کوردیدا هاتوە ( مار بەفیکە لە کون دێنیتە دەر ) . کاتێ قەتارو کاروانەکان دەردەکەوتن لە دورەوە زرینگەی زەنگیان دەهات . لە کاتی شەڕو مەیدانداریشدا تەپڵ و شەیپوور کەلکەلەی جەنگی دەخستە سەری میرخاسان و دڵی ئازایانی دەدەماند ، کار بەوەش ڕانەوەستا مۆزیقە تێکەڵاوی زۆربەی ئاینەکان بوو ، تەنانەت ئاینە ئاسمانییەکانیش ، بانگدان و قورئان خوێندن و بەسەرهاتی پێغەمبەران لە سەرهەوای مەقام خوێندن دەف و دمبك بەزمی دەروێشانی جۆشاند ، ئەرغەنوون لە کلێسادا سحری پژاند نزاو پاڕانەوەو کڕنوش بردن کەوتە سەر لەرەی مۆسیقا ، زۆربەی کلێساکانی ئاوروپا تیپی مۆزیقەو کۆرالی تایبەتیان پێکەوە ناو گەلێك لە مۆزیقەژەنەکانی جیهانی وەك ( یوهان سبستیان باخ 1685 — 1750 ) لەم مەیدانەوە دەرکەوتن و بوون بە موڵکی هەموو مرۆڤایەتی .

**لە کوردستانەکەی ئێمەشدا هەر لە کۆنەوە ئەشق و سروشت و باری ئابووری و چەوساندنەوە ڕەنگی گۆرانی و مۆزیقەی کوردیان ڕشتوە . سروشتی شلخلوی و سەختی وڵاتەکەو تیژڕەوی ئاوەکانی و تیرو تۆخی ڕەنگە سروشتییەکانی و خوێنگەرمی و چوستی خەڵکەکەی جۆرە ئیقاعێکی گورج و سواریان بە مۆزیقەو گۆرانی کوردی بەخشیوە ، لەگەڵ ئەوەشدا دەزولەیێکی خەم ئامێزیان تیا هەست پێدەکرێ کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر باری ناهەمواری ئابووری کۆمەڵگەی کوردەواری و چەوساندنەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی جگە لەوەی کە مۆزیقەی کوردیش لقێکەو دەرژێتە ئەو چۆمە غەمگینەوە کە بە هەموو ڕۆژهەڵاتدا تێدەپەڕێ .**

گۆرانی و مۆزیقە چۆتە هەموو کون و کەلەبەرێکی ژیانی کوردەوارییەوە هەر وەك شایی و ئاهەنگی بێسازدەکرێ شین و شەپۆڕی ئازیزانیش بەسەردولکەو لاوانەوە دەگێردرێ . لە زۆر شوێن بەدەف لێدان مردوو دەبرێ بۆ سەر قەبران . دایکی کورد لەگەڵ نەزمی لانکەباو بێشکەدا لایە لایە بۆ کۆرپەکەی دەکا کە بەشی منداڵەکەیان وەك بەشی ئەوان نەبێ و شادو گەردن ئازاد بژی . گەڕی ساوەرکوتانەوەو دەستاڕهاڕین لەگۆرانی گەرم دەکرێ . لە قەزوان کردن و مازوچنیندا بەندو باڵۆرە دەگوترێ . وەستاو وەستاکار بەدەم جۆلایی و کەلاش چنین و چەکوش وەشاندن و دیوارهەڵنانەوە گۆرانی دەڵێن و گڕی دەروونیان دادەمرکێننەوە . پالەو جوتیارەکان لەکاتی گێرەو دروێنەو خەرمان هەلگرتندا جۆرە گۆرانێکی تایبەتی دەڵێن کە داخی دڵی خۆیان هەڵدەڕێژن لە دەست چەوسێنەرەکانیان و پەلارو توانج دەگرنە ئاغاو سەرکارەکانیان .

زۆر ڕووداوو شۆڕش و بەسەرهات بوون بە لاوك . خۆ ئێستاش لاوکی یەزدان شێرو سمکۆو شێخ مەحمود هەر خوێنیان لێدەتکێ . تەقەی مەترەلۆزو قرمەی جان بێزارو ◁

# دوو گۆرانی و دوو نۆتە

«وریا ئەحمەد»

**پێشەکیەکی کورت :**

لێرەودوا خوا یاربێ لە هەر ژمارەیەك لەم گۆڤارەدا دوو گۆرانیبەهەڵبەست و نۆتەوە، بڵاودەکەینەوە .. لەو گۆرانیانەی کە ئاوازی خۆمن ؛ یاخو ئامادە ورداپشم کردوون ..

ئەوەی شایانی باس و جێگەی سوپاسێکی بێپایانیشمە ئەم نۆتانەن کە ژمارەیان لە «٢٠» نۆتە زیاترە ، هەر هەمووی هونەرمەندی لێهاتووی کورد کاکە ئەنوەر قەرەداخی ئەرکی پیاچوونەوەی گرتە ئەستۆ هونەرمەندی خامە رەنگینیش کاکە سەلاح رەئووف ئەرکی نووسینەوەی نۆتەکانی بۆ دواجار بە خەتە خۆشەکەی خۆی گرتە ئەستۆ ؛ منیش لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم .. هونەری کوردیمان خاوەنی دوارۆژێکی زۆر رووناکە ، چونکە هونەرمەندانی وەك کاك ئەنوەرو کاك سەلاح زۆر خۆش بەختانەو بێ کەمتەرخەمی شەونخوونی بۆ دەگرن و بەتەنگ خزمەتکردن و پاراستنیەوەن .



**گۆرانی بۆتۆ مردم**

**هەڵبەست و ئاواز/فۆلکلۆری**
**گوتنی کۆرسی بلواجی**
**ئامادەکردنی وریا ئەحمەد**

رەنگی زەردم بۆتۆ مردم    کوڵەجەکەی خامەکە
دەستم لەبۆ مەمکۆڵەی برد    گوتی هەتیو وامەکە

* * * *

بە ماچ و دوو ماچ گیانەکەم    لێت نابم رازی
تا لەسەر سینەت چاوەکەم    نەیکەم دەستبازی

* * * *

بەماچ و دوو ماچ گیانەکەم    هیچت لێنایە
وابزانە نان بوو چاوەکەم    دات وەگەدایێ

* * * *

بە سەر گەڕێت بم گیانەکەم    نووری عەینەکەم
خۆمن بەبێ تۆ چاوەکەم    کوێرە زەینەکەم

---

▷

هاڕژنی تەیارەو نرکەی تۆپیان لێ هەڵدەستێ ، هەروەك لاوك چەند لاپەرەیێکی لە مێژووی ئەم گەلە پاراست لە چارەگی یەکەمی ئەم سەدەیەدا چەند ئەدیبێکی بەکارو خەمڵەبەر بناغەی شیعری تازەی کوردیان هەر لە سەرکێشی لاوك و حەیران و گۆرانی دامەزراند و

ـ گۆران ـ ی مەزنیش تەلاری ئەم هونەرە ناسکەی گەیاندە تەختی ئاسمان .

لە کاتێکدا کە دەنگ خۆش و گوێندەکان لە شەوانی بەفربارێندا لە دەوری ئاگردانەکانا بەسەرهاتی ئەشقە پاك و بێ ئاکامەکەی

ـ مەمی ئالان یان بەند بەند دەچڕی گەنج و گراویەکان بەچۆکی خۆیاندا دەدا . ئەحمەدی خانی پەیدابوو لە دەمی سەندنەوەو ئەم بەیت و بەندانەی کرد بە مەلحەمەیەك کە تاکورد مابێ پێوەی بنازێ . بەم جۆرە دەبینین گۆرانی و مۆزیقە رۆڵێکی گرنگی لە ژیان و مێژووی رووشنبیری کورددا گێڕاوە .

کانیەکەی بەرماڵ گیانەکەم   زیخ   دانە   دانە

یارم دانیشتووە چاوەکەم   زولف   ئەکا   شانە

• • • •

ئەم گۆرانییە یەکێکە لە بەرهەمەکانی تیپی مۆسیقای بلواجی کۆیە سالی (١٩٧٣) تۆمارکرا بۆ تەلەفزیۆنی بەغدا .

---




* دوای (C) دەگەڕێینەوە بۆ پارچەی (B) .

گۆرانی «لێم گەڕێ»

هەڵبەستی عبداللە پەشێو

ئاوازی / ووریا ئەحمەد   گوتنی / دلێر صادق

لێم گەڕێ ئەڕۆم ئەڕۆم تاکو هەم
ناگەڕێمەوە بۆ باوەشی غەم
لێم گەڕێ گیانە .. توو ئەم چاوانە

• • • • •

چیتر ئەم لاوە بەندەی جاران نیم
سەرمەستی بادەی خوای دلداران نیم
لێم گەڕێ گیانە توو ئەم چاوانە

• • • • •

چیتر پیادەی ڕێی دڕکاوی نیم
وەك منالی چاو فرمێسکاوی نیم
لێم گەڕێ گیانە توو ئەم چاوانە

• • • • •

وەرە دڵم تیمارکە
لە دلداریم ڕزگارکە
گیانە وا گەڕامەوە
بەم سۆزە حەسامەوە

• • • • •

ئەم گۆرانییە لەگەڵ تیپی بلواجی کۆیە تۆمار کراوە بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك لە سالی ١٩٧٢ زدا .

---

# دوو تێکستی فۆلکلۆری

تۆمار کردنی :

عباس عبدالله یوسف

## ( 1 )

چوومە مارا جەردیسی
مشکم دیت لە سە لیسی
توندیان بەسبۆ بە گوریسی
چەن خەنجەرێ خۆشناوا
هەموون کڕی بە دراوا
نابڕن مشکۆکی ساوا
خەبەرێ بدەنە هـناریێ
دەست پە دار بێنە خوارێ
کتکیان گرتو بنارێ
خەبەرێ بدەنە ئامۆکا
بینە کوڕێ سوکۆکا
بینن گوللەو پەرۆکا
کتکۆکیان گرت هەورۆکا
خەبەرێ بدەنە گوللەکی
بێنە هێورەی مللەکی
داخوا ناگرن لاقەکی
خەبەرێ بدەنە هەریرێ
حازر نەکەن زنجیرێ
کتکۆکیان پێ ناگیرێ
خەبەرێ بدەنە باتاسێ
بەس نەکەن فسـە فسێ
کتکۆکیان لێ ناترسێ

## ( 2 )

خڕنوکو مڕنوك دارێ تە دۆرێ دەستم درێژ کرد
گەییۆ خەندۆرێ ، چ خویشکم نەبـوون بدەم لەتۆرێ
خڕنوکو مڕنوك دارێ جوخینێ دەستم درێژ کرد
گەییۆ دۆخینێ
چ خویشکم نەبوون بدەم لە خوینێ
خڕنوکـو مڕنـوك خڕنـوك شین نـابی هەنـدی لێدەدەم
پەلکی پان نابی پەو دەمـەی یار لێـرە پەیـدا نابی .

- تێبینی ئەم دوو تێکستەو چەند تێکستیتـر لە گوندی (جۆنەڕەو)ی سـەر بە نـاحیەی خـەلیفان تۆمار کراوە
- فەرهەنگۆك

مارا = ماڵ
لەسە = لەسەر
بەسبۆ = بەستبوو
دراوا = پارە ، پول
پەدار = بەدار
(گوللەك) و (هناره) و (ئامۆکا) و (باتاس) و (هەریر) شوێنن لە ناوچەی سورچیاتیدا .
کتك = پشیلە
تەدۆرێ = لە دۆلاییدا
خەندۆر = شوێنێك کە قوول بێ ، خەندەك بێ .
تۆرێ = تۆڵە ، لەجیاتی
پەودەمەی = بەو دەمەی

# کــــەو

عبدالحميد فتاح احمد

کەو یەکێکە لەو باڵندە جوانو دەنگ خۆشانەی بە قاسپە قاسپی دڵفڕێنیان شاخو کێوو دۆڵەکانی کوردستانیان ئاوەدان کردۆتەوە . هەر بۆ ئەمەش لە زۆر ماڵاندا بەخێودەکرێ . لە شارەکاندا تا ماوەیەك لەمەوبەر ، خەڵکی وا هەبوو ، گوزەرانی ڕۆژانەی لەسەر شەڕە کەوبوو ، تا ئێستاش لە زۆر شاران ماوەو دەستەو تاقمی خۆی هەیە ، لادێیەکانیش ، لە زستانو پایزاندا ، تۆڕیان دادەناو ڕاویان دەکردن ، بۆ فرۆشتنی چ بە سەر بڕاوی چ بە زیندویی دەیان هێنانە شارە نزیکەکانو خەڵکی لەبەر تامی خۆشی گۆشتەکەی دەیان کڕی .. بۆیە لەم سی ساڵەی دوایيەدا . زۆر کەم بۆوەو لە زۆربەی شاخە نزیکەکان دەنگی نابیرێ . بەلام لەم چەند ساڵانەدا ــ لە زۆر لاوە ڕاوە کەو قەدەغەکرا . تا ڕادەیەکیش سەری گرتو ئەنجامێکی باشیدا ..

دیسانەوە دەست پێکرایەوە ، هەتا یاسایەکی تایبەتی بۆ دانەندرێو سزای توندی تێدا نەبێ ، خەڵکی لە قەلاچۆکردنی ناکەون . ئەمەش یەکێکە لە تەنگو چەڵەمەکانی دارستانیەکان . تا ئێستاش بە تەواوەتی لەم باڵندە ناسکە نەکۆڵدراوەتەوەو شتێکی ئەو تۆی لەسەر نەنوسراوەتەوە ، ئەوەی بەرچاوم کەوتوە یەك ــ دوو باسی لاوەکی ناو گۆڤارو ڕۆژنامە کوردیەکانەو بریتین لە باسی سەرپێیی‌و یادداشتو تاقی کردنەوەی نایبەتی . لەبەر ئەوە . حەزم‌کرد ــ بە پێی توانای زانستی خۆمو ئەو سەرچاوانەی وەدەستم کەوتن ــ شتێکی تۆزێ زانستی لەسەر ئەم باڵندە خۆماڵیە بنووسم .

## ـ نــــاو ـ

ئەم باڵندە مام ناوەنجییە ، جوانە ، دەنگ خۆشەی بە کوردی پێی دەوترێ ( کەو ) ، عەرەب بە ( الحجل الرومی ) یان ( دراج الصخور ) ناوی دەبەن . تورك پێ دەڵێن (ئۆکلك)ە لای ئینگلیزەکان بە ( Chukar partridge) بەناو بانگە ، بەلام بە لاتینی ــ کە ناوی زانستیانەیە ــ بە کەو دەووترێ ( Alactoris ) وکەوی کوردەواریمان ناوی ( Alactoris Kurdestanica) ی هەڵگرتووە .



## ـ پلـــــە ـ

کەو لە پلە ( رتبە )ی پەلەورە Galleformes کە جگە لە هەندێ باڵندەی کێوی تریش دەگرێتەوە . وەك : سوێسكە تاووسو ... باڵندەکانی ئەم پلەیە چەند پۆل ( فصیلە ) ی دروست دەبێ لەوانە پۆلی Phasinidae یە کە کەو باڵندەیەکیەتی .

بە گشتی ، پەلەوری پۆلی Phusinidae بە کونە لووتی بێ پەڕو مەچەكو پەنجەی ڕووتیان لەوانی تر جیا دەکرێنەوە

لە ولاتی عەرەبدا ، پێنج ڕەگەزی ئەم پۆلەی تێدا دەژی ڕەگەزێکیان سۆێسکەی ڕۆمی Kaup و کەوە

ڕەگەزی کەویش چوار جۆر باڵندە دەگرێتەوە ، دووانیان لـە کوردستاندا دەژین :

— Alactoris Kurdestanica کە کەوی خۆمان دەگرێتەوە ، لـە شاخەکانی کوردستاندا پۆل پۆل دەبینرێن .

— Alactoris Gralce کە کەوی سپی‌یە ، بە زۆری لە ناوچەی قەراجو شەنگاردا بەرچاو دەکەوێ .

— Alactoris Sinaica لە بیابانی ( سینا )ی عەرەبی‌دا هەیە .

— Alactoris Philbyi لە نیوە دورگەی عەرەبی‌دا دەژی .

## — ژیـانو گوزەران —

پلەی گەرما : هەرچەندە حەز لە شوێنی فێنك دەکـــاو ئاشنایی لەگەڵ گەرمە شێردا نی‌یە ، بەڵام بە پێی ئەو تـــاقی کردنەوانەی شارەزاکانی ( ئەمەریکا ) لە ویلایەتی ( ئەلینوید ) و ( کالیفۆرنیا ) دا کردوویانە ، بۆیان دەرکەوتووە کە ئەم باڵندەیە تا رادەیەك بەرگەی گەرماو سەرما دەگرێ ، چونکە کەوی ئـەو ناوچەیە لە پلەی ( ٤٥م° )لە هاویندا دەژیا .

لە زستانیشدا ، بەرگەی سەرمای ( سفر ) و ( ژێرسفر) یش دەگرێت.شێ : خۆشترین ناوچەیە کـــە کـــەو تێدا بحەسێتەوە ، ئەو شوێنانەیە کە سالی ( ٤٠٠ ملم ) بارانی لێ دەبارێ . بەڵام دەتوانێ لە جێگا وشکەکانیشدا وەك جێگـــا ساردەکان — گوزەران بکا — شارەزاکانی ئەمەریکا ، هێـلانەی کەویان لە بیابانی ( مۆهافی ) سەر بە ویلایەتی ( کالیفۆرنیا ) دا دۆزیوەتەوە کە لە هەرێمە هەرە گەرمەکانی جیهانە ، بە تایبەتی لە مانگی تەمووزو ئابدا بە ئاسانی ژیانیان تێـدا بردۆتە سەرو زاوزێشیان کردووە .

هەر چەندە کەو سەرما زۆر قالسی ناکا ، بـــەڵام لــە زستاندا ئەو شاخانە بەجێ دەهێڵێ کە بەفری لێ دەبارێ بـۆ ئاوو هەوای خۆش‌و خواردن‌و خواردنەوە لە دێ‌یەکانی بنـــار نزیك دەبێتەوە،کە هاوینیش داهاتەوە روو دەکاتەوە شـوێنە بەرزە خۆشەکان .

بەرزی : لە دەشتەکاندا،لە دۆڵە قوڵەکاندا ، لـــە کێوە بەرزەکاندا . . . تا ئەو شاخانەش کە بەرزیان دەگاتە ( ٣٠٠٠م ) لەرووی دەریاوە ، دەژی‌و هێلانەی خۆی دروست دەکات .

مەڵبەند — کەو لە ئەمەریکادا زۆرە بە تایبەتی لە ویلایەتی : کالیفۆرنیا ، نیڤادا ، یۆتا ، ئەریگۆناو هەروەها لــە ئەوروپا و دورگەکانی دەریای ئیجەو یۆنان ، بالکان‌و شاخەکانی هیمالایاو چین‌و مەنگۆلیاو هیندو پاکستان‌و تبت دا . هەیە ، لـــە وولاتی عەرەبیشدا ، لە میسرو ئوردون‌و نیوە دورگەی عەرەبی‌و سوریادا دەست دەکەوێ ، بەڵام لە هـــەموو شـوێنەکی کوردستاندا بەر چاو دەکەوێ .

## — پێوانـــە —

کەو ٣٢ — ٣٥ سم درێژ دەبێ ، دەنووکی پـــان‌و کورت‌و بەهێزی ١٤ — ٢٠ ملم دەبێ ، بۆ چینەو چنینەوەی دانەوێلەو جۆرو جانەوەرو کرم گرتن بەکاردێ ، باڵەکانی ١٥٠—١٨٠ ملم دەبن ، درێژی کلکی لە ١١٠ ملم تێ ناپەرێ‌و لە ( ١٤ ) پـــەرە مووچ پێك هاتووە ، بەڵام مەچەکی ٤٠ — ٥٠ ملم درێژ دەبێ ، نێرە کەو بەرنە ( دڕکە)ی مەچەکی لە ماکەو جیا دەکرێتەوە .

## — رەنـگ —

بە گشتی لەشی کەو بە پەڕو توك‌و پەڕە موچی شـــینی خۆڵەمێشی داپۆشراوە ، کەوانەی رەشی سەرو چاوی ، بـە هەردوو لادا دەکشێ‌و لە سەر سنگی‌دا ئارام دەگرن . توکی ژێر سینگ‌و کلکی : ئەسمەر رەنگن . ناو قەدی ، ســپی‌و رەشی تێکەڵ بە قاوەیی رەنگ خۆی دەنوێنێ . رەنگی هـــەردوو گوێچکەی قاوەیی باوە ، پێلوی سوری کاڵن ، بەڵام هەنـدێ جار کەوی قاچ پرتەقاڵی مەیلەو زەردیش دەبینرێ .

## — راکردن‌و فـرین —

باڵی کەو ئەوەندە کورتن کە ناتوانن لەشی هـــەڵگرن‌و بەرزی بکەنەوە ، بۆیە لە فرین‌دا بلش نی‌یە ، بە ناچاری پەنـا دەباتە بەر رۆیشتن‌و راکردن ، بۆ گوزەرانی ژیانی رۆژانـــەی دەروا ، بەڵام کە تووشی دوژمن دەبێ‌و مەترسی ئەوەی لێ دێ ئازار بدرێ ، خێرا رادەکاو خـــۆی دەشـارێتەوە ، رەنگیش یارمەتی خۆ شاردنەوەی دەداو کە مەترسیەکە تەنگاوی کرد ، پەنا دەباتە بەر فرین .

فرینی‌کەو ئەوەندە کەمە لە بازدان دەچێ ، هەر بازدێکی ٣٠ — ١٠٠ م دەبێ، هەرچەندە باڵەکانی فش دەکاو دەیجولێنێ بەڵام زۆر بەرز نابێتەوەو هەتا زۆر تەنگاو نەبێ نافرێ ، بۆیە بە گشتی رۆژی ٢ کم دەفرێ ، کەو چەند بفرێ لە شوێنی خۆی دوور ناکەوێتەوە ، بە پێی تاقی‌کردنەوە دەرکەوتووە کە کەو حەز لە گوازە گواز ناکا ، لە هەموو حالێکدا ٧٠ — ٨٠ کم پتـر لە شوێنی خۆی دوور ناکەوێتەوە .

## — لە خۆڵ گەوزان —

کەو یەکێکە لەو باڵندانەی بۆ خۆ پاك‌کردنەوە پەنا دەباتە



بەر ئاو . لەشیو پەڕەکانی بە خۆڵ پاك دەکاتەوە . بە تایبەتی لە وەرزی بەهارانو هاوینانداا . خۆی لە خۆڵ دەگەوزێنی . هەموو جارێ ( ٥ ـ ١٠ ) دەقیقە خۆی لە خۆڵی ڕێگاو بـــانو زیخی سەر جۆگەو رووبارەکان دەگەوزێنێ . پاش ئەوە چەنـد جارێ خۆی رادەتەکێنێ تا ئەو خۆڵەی لێ دەبێتەوە .

## ـ قاسـپە قاسـپ ـ

کەو و ماکەو . بـە دەنگە خۆشە ناسکە دلفڕێنـەکانیان هەستی مرۆڤ رادەکێشنو جۆرە ئارەزوویەکی تایبـــەتی لە گیانیدا دەبزوێنن . بۆیی زۆربەی دانیشـتوانی کوردستان حەز لە پەروەردەی دەکەنو لە ماڵدا بە خێوی دەکەنو شانازی بـە دەنگی خۆشی کەوەکانیانەوە دەکەن .

ئەم باڵندەیە لە هەموو وەرزێکدا دەخوێنێ . بە تایبەتی لە بەهاراندا لە کاتی زاوزێدا . لە بەرەبەیانو خۆر ئاوا بووندا. بەڵام قاسپە قاسـپی نێرەکەو لە هی ماکەو زۆرترە .

کەو حەز دەکا لە شوێنی بەرزدا بخوێنێ . کە ئامادە دەبێ. بە چوار دەوری خۆیدا دەڕوانێ . لە گەڵ قاسپە قاسپدا مل بەرز دەکاتەوە . هەرچەندە خەڵکی شارەزای خوێندنی نین و بەڵام کەو بازەکان بۆیان دەرکەوتووە کە ئەم باڵندەیە بە چەنـد جۆرێك دەخوێنێو هەر خوێندنێك بۆ مەبەستێکە . ئەو جۆرە خوێندنانەی تا ئێستا زاندراوە ئەمانەن :

ـ قاسـپە قاسـپی شەڕ .
ـ خوێندنی راچڵەکینو ترس .
ـ قاسـپە قاسپی زاوزێ .
ـ خوێندنی خواردنو خواردنەوە .
ـ قاسـپە قـاسپی بەرد بەیـان .

## ـ زاوزێ ـ

کەو وەك هەموو باڵندەکانی تر بەهێلکە زاوزێ دەکا ، لـە سـەرەتای بەهاراندا کە پلەی گەرمای ناوچەکە بەرز دەبێتەوە بەفری سەر شاخو ناو دۆڵەکان بەرەو توانەوە دەچن . نێرەکەو زۆر بە گەرمی و بە سۆزەوە دەخوێنی . قاسپە قاسپیان ئـەو ناوە دەگرێتەوە تا بە ماکەوەکانیان دەگەن ــ جاری وا رێـــك دەکەوێ نێرەکەوێ دوو ــ سێ ماکەو لە چوار دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە . پاش رێك کەوتنو جووت بوون بەجووتە هێلانەی خۆیان لەسـەر باڵو ژێر دارو دەوەندا دروست دەکەن .

**هێلکە ـ** ماکەو لە مانگی مایسو حوزەیراندا هێلکە دەکاو لە هێلانەکەیدا حەشاری دەدا . هێلانەکە دەوری نۆ هێلکەی تێدا دەبێ . پاش ئەوەی لە هێلکە دەچێتەوە،بۆ ماوەی بیستو یەك رۆژ . ماکەوەکە لەسـەری کولك دەبێو هێـلانەی خـۆی بەجێ ناهێڵێ . تەنیا لەکاتی خواردنو خواردنەوەدا تەبێ کـە ئەمەش رۆژی لە ( ٤ ــ ٥ ) دەقیقە تێ ناپەڕێ .

**شـەڕ ـ** شەڕە کەو لەم وەرزەدا ــ چ لەســـەر ماکەو چ لەسـەر شوێن زۆر دەبێ ، چونکە وارێك دەکەوێ ، ئـــــەو ماکەوەی لە تەك نێرە کەوێکدا جووتبووە ، گوێی لە قاسـپە قاسپێکی خۆشتر دەبێو دەنگی خۆشی نێرەکەوەکە ماکەوەکە شەیدا دەکاو دەبەوێ لە دۆستە کۆنەکەی دوور کـەوێتەوە . نێرە کەوەکە بەم دەستەیە رازی نابێو بە هەموو توانای هەوڵ دەدا ماکەوەکە لەلای خۆی بهێڵێتەوە . بەڵام کە زانی چـارە نییەو هەر دەڕوا . دوای دەکەوێ تا دەگاتە لای نێرە کەوەکەی تر . ئەوسا هەردوو نێرە کەو ــ لەبەر چاوی ماکەوەکـــــە دەکەونە یەكو شەڕ دەکەن تا یەکێکیان زاڵ دەبێو ماکەوەکـــە بۆ ئەو دەمێنێتەوە .

هەروەها . لەم وەرزەدا ماکەویش تووشی شەڕ دەبێ . چونکە وا رێك دەکەوێ بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن ــ دوو ماکەو لەیەك شوێندا هێلانەی خۆیان دەکەنو هێلکە دادەنێن . کـە لێك ئاشکرابوون . هەردوو ماکەو تێك بەردەبێو شـــەڕ دەکەن تا یەکێکیان دەدۆڕێو هێلانەکە بەجێ دەهێڵێ . چونکە لە دنیای کەودا ــ وەك دنیای مرۆڤ ــ گەورەیی و دەســەڵات بۆزاڵبووو سەرکەوتووانە .

**بەخێوکردن ـ** پاش ئەوەی هەموو بێچووەکان لە هێلکە دێنە دەردەوە . بەگشتی دەوری هەوت بێچووەکەو دەترەکێو ماکەوەکە سەر پەرشتیان دەکات تاووشك دەبنەوە . ئەوسا بـــە دوای دایکیاندا هێلانە بەجێ دەهێڵن . ماکەوەکـــە کـــرمو جرو جانەوەریان بۆ دەگرێو دەرخواردیان دەدا . ئەوەی ســـەرنج ڕادەکێشی . بارەکەو زۆر ترسنۆکەو بەسڵ کـــردنەوەوە

دەجوولێتەوەو هــەر هەســــتی بەشتێ کـرد خێرا خۆی خەشاردانی بارەکەو لەهی بێچوی باڵندەکانی تر خێرا ترە ، بارە کەوەکان لەگەڵ دایکیاندا دەژین هەندێ جار نێرەکەویش تا ساڵێك ماکەوەکەی خۆی بەجێ ناهێڵێ ـ تا بەروازەدەبن ـ هەموو هاوین‌و پایز ماکەوەکە بەجێ ناهێڵن هەندێ جـــــار بارەکەوەکان لە زستانیشدا لەگەڵ ماکـــەوی دایکیانـــــدا دەمێنینەوە. بەڵام بەگشتی بارەکەو لەسەرەتای زستاندا لــــە دایکیان جیا دەبنەوە .

## ـ مرۆڤو کـەو ـ

هونەری بەخێو کردنی باڵندە ، زۆر کۆنەو دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەك پێش زایینی . بۆ بەڵگەی ئەم قسەیەشمان وێنەی باڵندەکانی سەر دیواری ئەشــکەوت‌و پەرســــــتگا دێرینەکانە. باسی باڵندە هەتا لە کتێبە پیرۆزەکانیشدا هاتووە، مرۆڤی کۆن ڕاوی ئەو باڵندانەیان کردووە چ بۆ گۆشتەکەی چ بۆ پەڕەکەی ـ کە سودیان لێ وەرگرتوە ـ کەو لەو باڵندانە بووە کە لە زۆر کۆنەوە مرۆڤ ڕاوی کردووەو گۆشـــــــــتە خۆشەکەی خواردووە .

## ـ ڕاوە کـەو ـ

کەو بە زۆر شێوە ڕاو کراوەو ڕاو دەکرێ بە بەرد ـ تیر ـ چەك ـ داو ... ئێوا هەیە شانزدە جۆر ڕاوە کـــەو دەزانێ . ڕاوە کەوی کێوی بە کەوی ماڵی بـــــە ناوبانگترین ڕاوی کۆن‌و تازەیە . هەر چەندە لە کوردستاندا ڕاوە کەو زۆر باو بووە . بە تایبەتی بۆ گۆشتەکەی . بەڵام لەم دواییەدا تەنیــــا هەندێ ڕاو چی‌و قەرەج نەبێ کەسی تر ڕاوەکەو ناکاو لــــەم دواییەدا جووتی کەوی کوژراوی دەست قەرەجەکان بە چوار دینــــــار فرۆشراوە .

کەوی ماڵی بە قەفەزە کەیەوە دەبرێتە ئەوشوێنانەی کە کەوی کێوی تێدایەو لە ژێر دارو دەوەندا دەشاردێتەوە چ بـــە قەفەزەوە چ بە قاچ بەستن‌و چوار دەوری بەداو دەتەنن . کەوە ماڵیەکە لە خۆشیی ئاوو هەواو جوانیی ناوچەکە دەست بـــە خوێندن دەکاو قاسپە قاسپی ئەو نـــاوە پڕ دەکات . کە کـــەوە کێویەکان گوێیان لەم دەنگە بێگانەیە دەبێ خۆیان بۆ شــــــەڕ ئامادە دەکەن‌و قاسپە قاسپی جەنگ سەرهەڵدەدا . ســـــەبر ســـەبرە لێی نزیك دەبنەوەو بە چوار دەوری کەوە ماڵیەکــــەدا دەسوڕێنەوە تا بە داوەوە دەبن ـ هەر ڕاوێ ـ ( ١ ـ ٥ ) کەو بەداوەوە دەبن .

کەوی ڕاو زۆر بەنرخ‌و گران بەهایە ، جووتی کەوی ڕاو ( ٢٠٠ ) دینار دەکات‌و لە شارەکانی دەفرۆشرێن .

## شەڕە کەوی شاری : ـ

کەو باز لە کوردستاندا تا ئێستاش زۆرە ، بۆ نمونە لـــە پارێزگای هەولێردا چوار هەزار کەو بازێك هەیە ، کـــــەوو بارەکەوی کەو بازان زۆر بەنازو نیعمەت بەخێو دەکـــرێن . دەکرێنە ناو قەفەزی جوان‌و ناسك ، بە گشتی دوو قەفـەز پێکەوە دەبەسرێتەوە بۆ نێرە کەوو ماکەو بە قوماشێکی جوان سەریان دادەپۆشرێ . لە بەهارو پایزاندا کەو بازەکان لـــە شوێنێکی تایبەتی کۆدەبنەوەو هەر لەو شوێنەشدا ســــەوداو مامڵەت دەکرێ‌و شەڕە کەو دادەمەزرێ . کەو بازەکان دوو ـ دوو کەوە کانیان لە گۆڕەپانی شەڕدا بەرەڵڵا دەکەن‌و هەموویان بە چوار دەوری هەردوو کەودا دەوەستن . شەڕەکەو بۆماوەی ( ٣٠ ـ ٤٥ ) دەقیقە بەردەوام دەبێ‌و ئەو کەوەی لـــە شەڕدا سەردەکەوێ ، نرخی دەگاتە (١٥٠ دینار ) ، بۆیە خاوەنی کەوو کەو بازەکان دڵخۆش دەبن .

## سەرچاوەکان : ـ


١ ـ الطيور العراقيه ـ الجزء الثاني : رتبة دجاجيات ـ رتبة نقارات الخشب .

٢ ـ مجلة الثورة الزراعيه ( عدد ـ١ـ ) كانون الاول سـنة ١٩٧٩ .

٣ ـ مجلة الثورة الزراعيــه ( عدد ـ٥ـ ) لسنة ١٩٧٩ .

٤ ـ جريدة العراق ( عدد ١٩٨٠ ) لسنة١٩٧٩ .

٥ ـ دیتنی هەندێ کەو بازی ناوچەی هەولێر .

6 - Tahir. I. Salih 1962.
Chukar partride of Asia, wildlife management,150.

7 - Charles seribners Sons 1954.
Americon Came birds of field and forest. Their habits, Ecology amagement. New xear.


**بۆ زیاتر بە پێزکردنی ئەم باسە وا ئێمەش ئـــەم چەند تێبینییە دەردەبڕین :**

١ ـ لە کوێستانی کوردوستاندا جۆرە کەوێکی گەورە هەیـە درێژی‌و پانیەکەی لەوەی دەست نیشان کراوە زیاترەو پێی دەڵێن « کەودەری » .

٢ ــ کەو بەسەرما زۆر قەرسەو گەلێك جار لە ڕۆژگاری بەفرو سەهۆڵدا خۆی دەکوتێتە ناو ئەشکەوتێکو زۆر جـــار دەبێتە خۆراکی گورگ‌و ڕێوی‌و بە ئاسانی دەکەوێتـــە دەست ڕاوکەران .

٣ ــ لە جۆرەکانی ڕاوی کەو ، جۆری ڕاو بە (دێوجامە)ش هەیە کە جۆرێکی زۆر بڵاوەو ،پەیوەندی‌یەکی زۆری بـــە ڕەنگەکانی دێوجامەوە هەیە کە زۆربەی ڕەش‌و زەردە .

٤ ــ ئەو کەوەی کە ڕاوی پێ دەکرێ بەبێ قەفەزو دەســـت بەجێ لە مەیدانی ڕاودا دەبەســـترێتەوەو پێی دەڵێن ( ڕوباد ) .. ئەم جۆرە کەوی ڕاوی‌یە بە دەگمەن دەست دەکەوێت .

٥ ــ لە فۆلکلۆری کوردیدا باسی قەفەزی کەو کراوەو دیارە کە لە کۆنەوە لەگەڵ ئەم جۆرە مەلەدا ئاشـــنایە ، وەك دەوترێ :

هەدار هەدار دار چەماوە<br>
گەڕا پشتی چەرمی خاوە<br>
زیندەوەرەکی جوانی لە ناوە

ــ کاروان ــ

---

# شۆڕە

**جلال ملاحسن خۆشناو**<br>
**هەولێر**

**شۆڕە : واتە باروتی خۆماڵی .**

**چیاکانی کـوردستان ئـەشکەوتی زۆرەو لە پـاییزو زستاندا دەبنە مۆڵگای مەڕو ماڵات . لە ئەنجامی زۆر مانەوەی ئەم مەڕو ماڵاتەدا ، ئەشکەوتەکان پڕ دەبن لە پەیین‌و چێن دەکەوێتە سەر چێن . کە بەهار داهات ئـــەوانـــەی شـــۆڕە دروســـت دەکـــەن ، دەچـــنـــە ئەشکەوتەکان ، بەگەسك ئەی ماڵن‌و سەرەکەی لە تۆزو خۆڵ پاك دەکەنەوەو لێی ئەکەڕێن تا هـاوین دادێ . ئەو پەینەی کە چێن لەسەر چێن کۆ بوەتەوە شتێـکی سـپی وەك خــوێ دەر دەدات‌و لە چـلەی هاویندا بە گەسك خـڕ دەکرێتـەوەو دەخرێتـە ناو توورەکەیەکەوەو ئەیهێننەوە ماڵ ..**

**ئنجا توورەکەکە لەناو تەشتێك دا دەندرێ‌و ئاوی کوڵاوی بەسەردا دەکرێت بۆ ئەوەی بشوردرێتەوەو بتاوێتەوە ناو تەشتەکە . هەموو ئاوو شۆڕەکە لە پارچەیەك لباد ئەکرێت بۆ ئەوەی بپاڵێورێت ..**

**ئاوە پاڵاوتەکە لەناو مەنجەڵێك دەکوڵێنرێت تا وەك دۆشاو خەست ئەبیت . لە دواییدا دەخرێتە ناو تەشتێك‌و ئـەم ئاوەی کە دەکەوێتە ژێر شۆڕە مەیێوەکە لێی دەڕژێنن .**

**ئەم شۆڕەیە دوو جاری دی لەناو ئاودا دەکوڵێنرێت تـا وەکو خوێ سپی دەبێت‌و شێوەی شۆڕەکە وەکو لوولەی بچووکی لێ دێت لەناو مـەنجەڵەکـەدا . لە پاشـدان بە ڕێژەیەکی ڕێك ، یەك جێ گۆگرد ، شەش جێ شۆڕەو یەك جێ ڕەژوو لەیەك دەدرێ‌و لە جۆنی یان هاوەندا ئەکوترێ تا خۆی لەیەك دەداو بە تەواوی تێکەڵاو دەبێت‌و ئەبێتە شۆڕەی ئامادە کراو ..**

**بۆ دڵنیا بوون کە بزانن شۆڕەکە ئاگر باش دەگرێت یان نا ، تۆزێکیان لەم شۆڕەیە دەخستە سەر گەڵا چرویکەوەو پەلە قاوەی بە ئاگریان لەسەر دا دەنا . ئەگەر زوو ئاگری بگرتایەو بەرز ببایەوە مانای ئەوەیە شۆڕەکە باش دروست بووە**

**وە ئەگەر کفە کفی بکردایەو بە ئاسانی هەڵنەستابا مانای ئەوە بوو شۆڕەکە نـەبووەو دووبـارە لەناو جۆنیان دەکوتایەوە تاکو شۆڕەکە دەبوو . لە کۆنەوە شۆڕە خۆراکی چەکە کـۆنەکـان بووە وەك تفـەنگە ڕەشکە یان گوللە زەن یان تـۆپەکـانی وەستا ڕەجب لەسەر دەمی پاشای کۆرەدا لە شاری ڕواندوز .**

# ئاوەڵناو لە ڕستەی کوردی دا بەکەرەستەی دیالێکتی کرمانجی خوارووو کرمانجی ژووروودا

دکتۆر کوردستانی موکریانی

سەرەتا :

ئاوەڵناو لە نێو زۆربەی بەرهەمی ڕێزمانی کوردیدا لە ڕووی مۆرفۆلۆژییەوە باسکراوە . بەڵام لە ڕووی سینتاکسەوە وەکو بابەتێکی سەربەخۆ لێی نەکۆڵدراوە . بەڵکو جار بە جار ئەرکێکی سینتاکسی بە شێوەیەکی کورت خراوەتە ڕوو .

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە ( ڕێزمانی کوردی ) دا ...(١) لە بابەتی ئاوەڵناودا لە باسی ( ئەرکی ئاوەڵناوی خەبەری چییە لە ڕستەدا ؟ ) دەڵێ :

( ئاوەڵناو ١ ـ ئەبێتە سیفەی ناو . ٢ ـ ئەبێتە تەواوکەری ( سەربار ) ی کاری بن هێز ).

ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕاکێشە مامۆستای نێوبراو هێندێك بەشی ئاخافتنی دی بە ئاوەڵناو لە قەڵەم داوە . بۆوێنە :

جێ ناوی نیشانەی بە ( ئاوەڵناوی ئیشاری ) و جێ ناوی چەندی بە ( ئاوەڵناوی چەندی ) . جێ ناوی پرسیاری بە ( ئاوەڵناوی پرسیاری و ژمارەش بە ئاوەڵناوی چەندی موبهەم خستۆتە ڕوو . هۆی سەرەکی ئەم تێکەڵاوییەش بۆ نەبوونی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ دەگەڕێتەوە . کە ئەرکی سینتاکسی بەشەکانی ئاخافتن پێشان بدا و ڕوون بکاتەوە

پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە بەرهەمی ڕێزمانی ( زمانی کوردی ) دا ... (٢) لەژێر باسی ئاوەڵناودا دەڵێ : ئاوەڵناو بە زۆری دەوری دیارخەر دەگێڕێ لە ڕستەدا و بە هۆی ئامرازی خستنە سەرەوە بە ناوی دیارخراوەوە دەبەسترێت . هەروا دەڵێ هێندێك ئاوەڵناو . کە دەکەونە پێش کلر دەوری ئادڤێربلی چۆنیەتی دەگێڕن .

زانای نێوبراو لە کتێبی ( ڕێزمانی کوردی ) دا ...(٣) لە بابەتی ئاوەڵناودا . کە وەکو بەشێکی ئاخافتن لێی دەکۆڵێتەوە دیسانەوە باسی ڕۆڵی ئاوەڵناو وەکو دیارخەر دەکات و دەڵێت لەو کاتەدا . کە ئاوەڵناو دەوری دیارخەر دەگێڕێت هەمیشە دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوەو لە ڕووی ڕەسەن و ژمارەدا لە گەڵیدا ڕێك ناکەوێت .

دکتۆر قەناتی کوردۆ لە دوا بەرهەمی ڕێزمانی چاپکراویدا ( ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو و سۆرانی )(٤) . کە تەنیا دووبارەی فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژییە لە بابەتی ئاوەڵناودا بەم جۆرە دەوری ئاوەڵناو لە ڕستەدا باس دەکات. ئاوەڵناو لە ڕستەدا چەند ڕۆڵێکی سینتاکسی دەگێڕێ و دەبێتە دیارخەر . نیهاد . بەرکار . دەربارەی شوێنی دیارخەر بەرامبەر بە ناوی دیارخراوەوە دەڵێ . ئاوەڵناو لە ڕۆڵی دیارخەردا دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوە لەگەڵ کۆتایی ئەو ناوەی ، کە لە گەڵی دێت ڕێك دەکەوێت . یان هەر وەکو خۆی دەمێنێتەوە بۆ ئەم ڕۆڵانەی . کە ئاوەڵناو لە ڕستەدا دەیانگێڕێ و لە سەرەوەدا باسمان کرد نووسەری نێوبراو بە چەند ڕستەیەکیشی ڕوون کردۆتەوە .

مامۆستایان ئا . سەیر نۆڤاو کەریمی ئەیوبی لە ( دیالێکتی کوردی موکری )دا (٥) لە باسی بەشەکانی ڕستەدا . چەند وێنەیەکیان هێناوەتەوە . کە ڕۆڵی ئاوەڵناو لە ڕستەدا پێشان دەدات .

دکتۆر ج.خ. بەکایێف لە بەرهەمی ڕێزمانی ( زمانی کوردەکانی سۆڤیێت ) دا (٦). لە بەشی مۆرفۆلۆژیدا و دەربارەی ئاوەڵناو لە دیالێکتەکانی کوردی تورکمنستان . ئازربایجان و ئەرمەنستانی سۆڤیێتی کۆڵیوەتەوە . هەر لەم بابەتە مۆرفۆلۆژییەدا بە شێوەیەکی کورت چەند ئەرکێکی ئاوەڵناوی لە ڕستەشدا ڕوون کردۆتەوە . بە تایبەتی ڕۆڵی ئاوەڵناو وەك دیارخەر و دەڵێ : ( ئاوەڵناو هەمیشە ڕۆڵی دیارخەر دەگێڕێت و پاشبەندی ئامرازی پێوەندی ( را . فا دا ) ی لە هەموو دیالێکتەکاندا پێوە دەلکێت . لەپاڵ ئەمانەشدا لە بەشە دیالێکتەکانی کوردی تورکمنستان و ئەرمەنستاندا لە ووشەی لێکدراوی دیارخەریدا ئامرازی خستنە سەر دەچێتە سەر ناوی دیارخراوەوە بەپێی ژمارەو ڕەسەنی .

چوونە سەری ئامرازی پێوەندی و ئامرازی خستنە سەر بۆ سەر ئەو ئاوەڵناوەی ، کە دەوری دیارخەر دەگێڕێ . ئەوە ناگەیەنێت کەوا ئەم ئاوەڵناوە لە لایەن دۆخ . ژمارەو ڕەسەن بگۆڕێ . ئاوەکو ئەم ئامرازانەی لە سەرەوە نێوبراودا لە ڕووی شێوەوە بە ئاوەڵناوەوە بلکێن . چونکە ئەم ئامرازانە بۆ ناوەکەی پێش ئەو دەگەڕێتەوەو دۆخ و ژمارەی ئەو پێشان دەدەن .

دکتۆر بەکاییف لە بەشی سینتاکسدا . کە بە کورتی باسی بەشەکانی ڕستە دەکات . چەند ڕستەیەکی هێناوەتەوە.

که ڕۆڵی ئاوەڵناو لە ڕستەدا پێشان دەدات .

وەنەبێ هەر ئەم بەرهەمانەی لە سەرەوە نێومان هێنــــان لە ئاوەڵناویان کۆڵیبێتەوە . بەڵکو زۆربەی زۆری بــەرهەمی ڕێزمانی . کە لە بەشەکانی ئاخافتنیان کۆڵیوەتەوە باســـــی ئاوەڵناویان کردووە . بەڵام لەبەر ئەوەی بابەتەکەی ئێمە سەر بە ئەرکی ئاوەڵناوە لە ڕستەی کوردیدا . هەموو بەرهەمێکی ڕێزمانی لێی نەدواوەو نووسەرەکانیان خۆیان پێوە خـــەریك نەکردووە .

بەم کورتە پێشەکی‌یە ئەوەمان بۆڕوون بۆوە کەوا ئاوەڵناویش وەکو بەشەکانی دی ئاخافتن هـــەر لە ڕووی مۆرفۆلۆژی‌یەوە بوێتەی پێ‌دراوە . هێندێك جاریش لا بەلا ئەرکێکی سینتاکسی خراوەتە ڕوو . پیشان‌دانی ئەم ئەرکەش بە شێوەیەکی گشتی هەر لەیەك دیالیکتدا بووە .

ئەم بابەتەی بەردەستان . کە بە نێوی ڕۆڵی‌ئاوەڵنـــاوە لە ڕستەی کوردیدا . لێکۆڵینەوەیەکە ئەرکی سینتاکســـی ئاوەڵناو لە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی زمانی کوردی ڕوون دەکاتەوە . کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەم ڕستەی هـــەڵبژێراوی تێکستی چاپکراوی کوردی‌یە .

**ئاوەڵناو لە ڕۆڵی نیهاد دا :**

ئاوەڵناو لە ڕۆڵی نیهاددا زۆر کەم بەکار دێتەو ئەو جۆرەی کە ئەم دەورە دەگێڕێ . ئاوەڵناوی چۆنیەتی‌یەو هیچ جۆرە نیشانەیەکی دۆخی پێوە نالکێتو هەمیشەش دەکەوێتـــــــە سەرەتای ڕستەوە :

تێر ئاگای لە برسی نییە ( پەندی کوردی ) .
گەرەو بچووك .. لەو بەڵێنە ئاگادارن ( ئاسك ـ ٩ ) .

گەورە ئاو دەڕێژێ . گچکە پێی لێ دەنێ (پەندی کوردی )

لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو‌ش‌دا ئاوەڵناوی چۆنیەتی دەوری تیهاد دەگێڕێ : ـ

گە هیشتە ئاڤایی ( سیابەندو خەجێ ـ ١٤٧ ) .

ئەو ئاوەڵناوەی . کە دەوری تیهاد دەگێڕێ لەوانەیـــە نیشانەی ناسیاری (ـ ە کە) و نیشانەی کۆ ( ـ ان ) یان پێوە لکابێت . وەك ئەم ڕستانەی خوارەوە : ـ

ڕەشەکانیش ڕێگەی ڕاستی‌یان لێ وون بوو ( هاوکاری ـ ٦٢٠ ) .

کۆنەکان خۆیان‌ڕازاندووە ( بەیان ـ ٥٤ ) .

ئەوەی لێرەدا شایەنی باسە ئاوەڵناو بەتەنێ نیشانـــەی ناسیاری ( ـ ە کە ) و نیشانەی کۆ ( ـ ان ) وەرناگـــرێ . هۆی هەبوونی لەم جۆرە ڕستانەی سەرەوەدا بـۆ ئـــەوە دەگەڕێتەوە . کەوا ووشەی ( ڕەش‌و کۆن ) لەگەڵ هێندێـك ناوی دی هاتوون‌و لێرەدا ناوەکـــان لاچوون‌و ئـــەم دوو نیشانانەشی‌یان هەر پێوە ماوەتەوەو لە بریتی ناوەکان دەوری نیهادیان گێڕاوە . کە خۆیان لە ووشەی لێکدراوی دیارخەری‌دا لەکاتی هەبوونی ناوەکەدا دەبنە دیارخەرو نەك نیهاد .

ئاوەڵناوی پلەی باڵاش دەوری نیهاد دەگێڕێ . بەڵام بــە شێوەیەکی سەرەکی ئەوەیان . کـــــە بەیارمەتی ( هەرە ) داڕێژراوە . بۆ وێنە :

هەرە قەڵەوەکەیان لەم دەوروبەرە خۆی شاردۆتەوە .
هەرەبچووکیان هەراسانی کردووم .

لە دیالیکتی کرمانجی ژووروو‌ش‌دا ئاوەڵناوی پلـەی باڵا ئەم دەورە دەگێڕی‌و دکتۆر ج . خ . بەکاییف لـــــە بەرهەمی ( زمانی کوردەکانی سۆڤێت . لە لاپەڕە ٢٧٩ ) دا . چەنـــــد وێنەیەکی لەم بابەتە هێناوەتەوە وەك : ـ

سەر دار سێڤ گەلەك بوون وەختا مە دار دهژاندن . ێی لاپە سۆر دکەتنە ئەردێ .

## ئاوەڵنـــاو لە ڕۆڵی گوزارەدا

**گوزارە لە ڕووی پێك هاتنی‌یەوە دوو جۆرە :**

١ ـ گوزارەی کاری ، کەبریتی دەبێ لە کار . بە واتا هیچ بەشێکی دی ئاخافتن وەك ناو . ئاوەڵناو‌و جێ ناو ناگرێتـــــە خۆی .

٢ ـ گوزارەی ناوی ـ کاری : کە لە ناو . ئاوەڵناو . جێ‌ناو‌و کاری بوون (بە شێوەیەکی سەرەکی ) و کاری کەوتن . چووەو کۆتایی‌یە کەسی‌یەکان دادەڕێژرێ .

جۆری دووەم . کە گوزارەی ناوی ـ کاری‌یە مەبەستی ئێمەیە چونکە پێوەندی بە بابەتەکەمانەوە هەیەو ئاوەڵناویش وەکو ناو‌و جێ‌ناو بەشداری ئەم چەشنە گوزاریە دەکات بـــە هاوکاری کاری بوون‌و کۆتایی‌یە کەسی‌یەکان .

ئەو ئاوەڵناوەی . کە بەشێك دەبێ لە گوزارەی ناوی ـ کاری بە شێوەیەکی گشتی دەکەوێتە پێش کارەوەو لە بـــاری

چەسپیودا دەبیو بۆلێکدانی ئاوەڵناوو کار هیچ جۆرە ئامرازێکی سینتاکسی ناکەوێتە نێوانیان .

وێنە بۆ کرمانجی ژووروو و کرمانجی خوارووو :

مێرەکی مێرخانیو عەگیت بوویە ( سترانێ زارگوتنـــا کوردا ـ ٤٠ )

ئەو بـاژێر گەلەکێ کەفن بوو ( هاوکاری=٣٨١ ـ ١٠ )
باقێ مەکال بونە . دایکێ مە پیر بونە (دەستی دی ـ ٨٢).
ژ ئالیێ تۆپکی دندا تەعف بلند دیو ( سیابەندو خەجێـ ١٤١ ) .

پاشا یەکجار کەلەگەت بوو ( ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ٢٦ ) .

شۆر مەحموود ئازابوو ( شۆر مەحمودو مەرزینگان ـ ٣٠).

لە بیرەوەریدا گەورە دەبن ( نووسەری کورد . ژمارە ٧ ، ١٩٨١ ـ ٤٨ ) .

تێگەیشتنی زۆر زەحمەت نەبوو . بەڵام بۆ جەمیلە کارێکی گران بوو ( جەمیلە ـ ٥٩ ) .

چیاکەی ئەوبەر تا دەهات تاریکتر دەبوو ( کوێر ئۆغلی ـ ٩٨ ) .

ئەو ئاوەڵناوەی . کە دەبێتە بەشێك لە گوزارەی ناوی ـ کاری وەنەبێ هەر لە پلەی چەسپیودا بێت . بەڵکو لـــە پلەی بەراوردیشدا دەبیو لە هەردوو دیالیکتەکەشدا وەکو یـــەك بەکار دێت :

دەبوو ( کوێر ئۆغلی ـ ١١٣) .

حەز کردنەکەم لە ترسەکـەم بەهێزتربوو ( جەمیلە ـ ٥٨ ) . میراجی ئەکاکی گەلێ ســافترو پوخـت تر بووەوە ( پالتۆ ـ ٣٣ ) تەماشاکرنا زۆرتربوو ( بەیان ـ ٦٣ . لاپەڕە ٤٤ ) .

هەروا گوزارەی ناوی ـ کاری لە ئاوەڵناوێكو کۆتایی کـەسی ( ـ م . ـی . ـە . ـ ین . . ن . ن ) لە هەردوو دیالیکتەکـەدا دادەڕێژرێت . ئـەوەی لێرەدا سەرنج ڕاکێشـە دمکانی کەسی سێیەمی تاكو کۆیە . کە لە چاوی کەسەکانی دی زێتر بەکاردێت .

وێنە بۆ کرمانجی خوارووو :
لە مداڵیدا شتەکان بچووکن ( نووسەری کورد . ژمارە ٧ ل ـ ١٤٧ )

ئەسپە بۆرە زۆر زۆر چاکە ( کوێر ئۆغلی ـ ٦٤ ) .
ئەمەیـان چیرۆکێکی کۆنە ( نووسەری کورد . ژمارە ٧. ١٤٦ ) .

وێنە بۆ کرمانجی ژووروو

ب ئە زمانی کوردی گوت : ( ئای خودی چەند گەرمە . . ) ( بەیان . ژمارە ٤٤ ) . فنکێ گوندەکێ رندو جوانە . دەکەڤیتە ژووریا جزیرا بۆتانا .

( هاوکاری ـ ٣٩١ ـ ٧ )

سیابەند نۆلی خەجێ بەرەوە ( سیابەندو خەجێ ـ ٨ )
ئاوەڵناوی پلەی بەراورد لەگەڵ کۆتایی کەسێش بەکار دێتو گوزارەی ناوی ـ کاری ـ دادەڕژێت . بۆوێنە :

وەکی مرنـا تەڤی سیـابەنـد ژ ژینا تەڤی بـرا چێترە ( سیابەندو خەجی ـ ٧ ) بر ٥٠ ـ ٦٠ سال بەرێ . نەحیبـا مەلەزگەرێ ( ماناز کێرت ) گوندێ مەترانێدا قەوماندنەك قەومی یاکو زوترە ( سترانا زار گوتنا کوردا بە تلرقی ـ ٤٤ ) .

دلی بە هیوا لە ڕوناکی ڕووناکترە .

دکتۆر بەکاییف لە هەمـان سەرچاوەی پێشوودا . کە نێومان برد دەلێ ئاوەڵناو لە پلەی باڵاشدا دموری ئاوەڵناوەکە داڕێژراوە گوزارەی ناوی ـ کاری دەگێڕێت . ئاوەڵناوەکە بە یارمەتی (لاپ) داڕێژراوە بۆ وێنە : ناز

نازێك شاگرنا منە لاپە ئاقلە .

لە دیالیکتی کرمانجی خوارووش ئەم جۆرە دارشتنەی ئاوەڵناوی پلەی باڵا . کە بەیارمەتی ( هەرە ) . دەتوانی هەمان دەور بگێڕێ :ـ

نلزك شاگردی منی هەرە ژیرە .

بەڵام ئەو ئاوەڵناوەی . کە بە یارمەتی نیشانەی ( ـ ترین ) دادەڕێژێت هەرگیز ڕۆلی گوزارەی ناوی ـ کاری ناگێڕێت .

وەنەبێ هــەر چاوگەی ( بوون ) هاوبەشی پێكهاتنی گوزارەی نـاوی ـ کاری بکات بـەلکو چـاوگەی دیش وەکـو ( چوون ) . ( هێنان ) یش وەکو بوون دەورگێرن :ـ

وەنەوشە لە گوێ کانیـاوەکان مۆر دەچوونەوە ( کوێر ئۆغلی ـ ١١٤ ) . شینـایی ئـاسمـان سپی سپی دەچـۆوە ( ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ٧٦ ) .

گـوزارە لە زمـانی کوردیدا شوێنی چـەسپیوو دیاری کراوی خۆی هەیە لە ڕستـەدا جا گوزارە چ کاریبن وەیـا

ناوی ـ کاری بن هەمیشە دەکەوێتە دوای نیهادەوە ئەگەر بەشەکانی دی ڕستە ( بەرکار . دیارخەرو ئادڤێربل ) لە ڕستەدا هەبن شوێنی گوزارە بەرامبەر بەنیهاد ناگۆڕێت . دۆخی گوزارەی ناوی ـ کاری لە هەردوو دیالێکتەکەدا ئەو بەشەی کە لە ئاوەڵناو پێك هاتووە هەمیشە لە دۆخی ڕاستەوخۆدا دەبن .

## ئاوەڵناو لە ڕۆڵی بەرکاردا

ئاوەڵناو وەکو ناوو جێناوو چاوگە دەوری بەرکار دەگێڕێ لە ڕستەدا . بەڵام گەربێتەوە لە ڕووی بەکارهاتنێوە لە گەڵ ئەوانەدا بەراوردی بکەین دەبینین بەکارهاتنی ئاوەڵناو لە چاو ناوو جێناودا زۆر کەمە .

شوێنی ئەو بەرکارەی . کە برێتییە لە ئاوەڵناو هەمیشە دەکەوێتە پێش گوزارەوەو لە دۆخی ڕاستەوخۆشدا دەبێت .
وێنە بۆ کرمانجی خواروو :

هەتا گەیشتە ناو گۆڕستانەکە . سێو دووی ترس شانمی بە تەواوی قورس کردبوو ( ١٠ چیرۆك ـ ٣٣ ) .

لالە جلەکانی تەڕ کرد .
بروا کتێبەکانی ڕێك خست .
وێنە بۆ کرمانجی ژووروو :
خالی ئاقۆ پێشین نانێ خوە لێ کرّ . دەولا ئاش تری کر ( دەستێ دێ ـ ٧٦ )

جماعەتا خوەو کولتورا وی جماعەتی نمزدکە ( سیابەندو خەجێ ـ ١١ )

## ئاوەڵناو لە ڕۆڵی دیارخەردا

ئاوەڵناو چ چۆنیەتی بێو چ نسبی دەوری دیارخەر دەگێڕێ . ئاوەڵناو لە نێو هەموو بەشەکانی ئاخافتندا لە گێڕانی دەوری دیارخەردا زۆر چالاکەو زێتر بەکاردێت دیارخەر لە ڕستەدا بەتەنیا نایەت . بەڵکو ووشەیەکی دی لەگەڵ دێت . کەزلراوەی ( ناوی دیار خراو )م بۆ داناوە . کاتێ ناوی دیارخراو بە پێش دیار خەرەوە دەکەوێت هەمیشە بە هۆی ئامرازی خستنە سەرەوە بەیەکەوە دەبەسترێن . بەڵام لەو بارانەی . کە دیارخەر بەپێش ناوی دیارخراو دەکەوێت . هەر وەکو لەمەودوا بەرچاومان دەکەوێت . هیچ ئامرازێك نابێتە هۆی پێوە لکاندنیان بەڵکو بەهۆی پێوەستی لێکدەری سینتاکسی لێك دەدرێنو ووشەی لێکدراوی دیارخەری پێك دەهێنن .

لەم ڕستانەی خوارەوەدا ئاوەڵناوی ( گەورە گەورە . کورت . در . ناخۆش . جوانکەلە . نەرمو نۆڵ ، چەتن ، تەزە ، گەش دەوری دیارخەریان گێڕاوەو کەوتوونەتە پاش ناوی دیارخراوەو بە هۆی ئامرازی خستنە سەری ( ـی ) لە کرمانجی خواروو ئامرازی خستنە سەری ( ـێد . ـ آ ) لە کرمانجی ژووروودا لە گەڵ ناوی دیارخراودا لێك دراون .

لە هەموو بەشەکانیدا دالانی گەورە گەورە هەبوون . کە لە هەر چوار لاوە بەپلیکنێکی کورتدا دەچوونە دەرێ ( گێلە پیاو ـ ١٨ ) .

باڵندەی درم وە دوو کەوتوون ( ئەفسانەی چیای ئاگری ـ٧٩ ) تەزوویەکی ناخۆش بە هەموو گیانیدا هات ( زەردەخەنە ـ١٢ ) کچێکی نازداری جوانکەلەی بەلادا تێپەڕی ( ١٠ چیرۆك ـ ٦٨ ) دۆشەکی نەرمو نۆلیان بۆ داخستبوو ( کوێر ئۆغلی ـ١٤٠ ) چ ڕۆژێد چەتن دەربازکرن ( دەستی دێ ـ٧١) گەلەك کۆمێد تەزەکرییە ناڤا پۆیمێ ( سیابەندو خەجێ ـ ١٠ ) مەلایێ جزیری ستێرەکا گەشە لە ئاسمانی تۆرێ کوردی (بەیان . ژمارە ـ٧٣ـ ١٩٨١ . لاپەڕە ـ٣ ).

وەنەبێ دەرخەر هەر لەیەك ئاوەڵناو پێك بێت . بەڵکو بۆی هەیە لە ئاوەڵناوێك زێتر بێت . کە بە هۆی ئامرازی خستنە سەر بە یەکەوە دەبەسترێنو زنجیرەیەك دیارخەر دروست دەکەن . جێگەی ئەم ئاوەڵناوانە . کە ئەم زنجیرەیان پێك هێناوە دەتواندرێ ئاڵو گۆڕ بکرێ بێ ئەوەی واتای ڕستەکە بگۆڕێت بە پێچەوانەی ناو . کە بە هیچ جۆر ناتواندرێ شوێنەکەی دەستکاری بکرێ . چونکە گۆڕینەکەی کار دەکاتە سەر واتاو شێوەی داڕشتنی ڕستەکە ...(٨)

وێنە بۆ کرمانجی خواروو :ـ

سنکە تووك چلکنەکەی هەلکران (١٠ چیرۆك ـ٨٣)

بەرگێکی جوانی لە قوماش لاهوری ئی وەکو چیرۆکو داستانیان دەتگوت درووومانی نەدیتبوو لە بەرکرد (ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ١٢١ ) . خاتوو نیگاریش وەکو ئەستێرەیەکی گەشی شین بە نێو کەژاوەکەیدا دە چریکایەوە ( کوێر ئۆغلی ـ١٤٨ ) .

وێنە بۆ کرمانجی ژووروو :ـ

ب ڕوحێ عەگیتیێ فێرز ( ئازلو سوار چاك ) تەربەت دکرد ( سیابەندو خەجێ ـ٢٣ ) . کچەکا گەنجا جوان جەم من ڕۆیشت ( بەیان ـ٦٣ـ لاپەڕە ٤٣)

ئەو ووشە لێکدراوە دیارخەرییانەی . کە لە زنجیرەیەك

دیارخەر پێك هاتوونو دیارخەرەکانیان برێتین لە ئاوەڵناو ئامرازی (و) پێویست دەتوانێ هەمان دەوری ئامرازی (ـی) خستنە سەر بگێڕێ . هەروا کوما (٤) ش هەمان دەور دەگێڕێ بێ ئەوەی کار بکاتە سەر سترکتورەی رستەکە ... (٩) :ـ

مفتی مرۆڤەکی زیرەكو بیرتیژ بوو ( بەیان ـ ٦٣ . لاپەرە ٦٦)

ب دەنگەکی خۆش‌و نەفی‌و پێکەنینەکا دل ڤەکەر گوتی .

( سەرچاوەی پێشوو ـ لاپەرە ـ٦٧ ).

شوانەکە تابلێی پیاوێکی رەق‌و لە خۆڕازی‌و جەرگ قایم‌و کەتەو بە خۆوە بوو . ( کوێر ئۆغلی ـ ١١٧ ) .

بەرێکەوت لەم رۆژەدا پالتۆیەکی درێژ . کۆن . بیناوی. چلکنی . لەبەردابوو. رۆشنبیری نوێ . ژمارە ـ٧ . لاپەرە ـ١٨ ) .

کاتێ . کە ئاوەڵناوی پلەی باڵا دەوری دیارخەر دەگێڕێت . لە ووشەی لێکدراوی دیارخەریدا دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە و بە هۆی پێوەندی لێکدەری سینتاکسی پێوەی دەبەسترێت . ئەم بارەی دیارخەر . کە برێتی دەبێ لە ئاوەڵناوی پلەی باڵا بە پێچەوانەی جۆرەکانی دی ئاوەڵناوەو لە رووی شوێن‌و پێوەندی سینتاکسی :

وێنە لە دیالیکتی کرمانجی خواروودا :

بێ گومان ئەوە جوانترین هەلە بۆ ئەوەی بیری لێ بکەینەوە ( نووسەری کورد . ژمارە ـ٧ . لاپەرە ـ٢٦ ـ ١٩٨١ )

بە راستی ئەو رۆژە گەورەترین جەژنی شادی بوو لە ژیانی ئەکاکی بەسزمانی‌دا ( پالتۆ ـ٤١) .

گومان لەدڵسۆزی‌و داوێن پاکی نزیکترین‌و دڵسۆزترین کەسی بکات ( نووسەری کورد . ژمارە ـ٧ . لاپەرە ـ٢ ) .

بەبێ‌ی بۆچوونی خۆم شارەزای رووناکترین لایەنەکانی ژیان ببوم ( جەمیلە ـ٦٢ ) .

لە دیالیکتی کرمانجی ژووروودا ئاوەڵناوی پلەی باڵا بە یارمەتی ئاوەڵناوی دها . ( هەرە ) بۆمێی تاك . ( هەری ) بۆنێری تاكو ئاوە لکاوی (لاپ) لە بەشی دیالیکتی ئەرمەنستاندا دادەرێژرێ ... (١٠) لە کاتی گێڕانی دەوری دیارخەردا وەکو ئاوەڵناوی پلەی چەسپیو دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوەو بە هۆی ئامرازی سەرەوە پێوەی دەبەسترێت . لە دیالیکتی کرمانجی خوارووش‌دا . کاتێ . کە ئاوەڵناوی پلەی باڵا بە یارمەتی ئاوەڵکاری ( هەرە ) دادەرێژرێت . ئەم دیارخەرەی لەو جۆرە ئاوەڵناوە دارێژراوە دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوە .

وێنە بۆ کرمانجی : ژووروو :

ئەزێ قیزا دها بەدەو دخوازم .

وێنە بۆ کرمانجی خواروو :

بەڵام خەمی هەرە گەورەم ئەوەبوو ئەم رەنگانە چۆن پەیدا بکەم ( جەمیلە ـ٥٩ ) .

وێنە بۆ کرمانجی خواروو :

دیاردەی دارشتنی ئاوەڵناوی پلەی باڵا بە یارمەتی نیشانەی ( ـ ترین ) لە دیالیکتی کرمانجی ژووروودا لەو چاپەمەنی‌یانە بەرچاو دەکەون . کە لە کوردستانی عێراقدا چاپ دەکرێن کە رۆڵی سینتاکسیشی هەروەکو رۆڵی ئاوەڵناوی پلەی باڵای کرمانجی خوارووە لە رووی شوێن‌و پێوەندی سینتاکسی‌یەوە لەگەڵ ناوی دیارخراودا . وەك لەم وێنانەدا دیارە :ـ

( من گەرێ دا پاکژکەم بە پاکژترین دەسماڵین خوە ( بەیان ) ژمارە ـ٦٣ـ لاپەرە ـ٤٥ ) .

لسەر نفیسەڤان پێتفیە بزوترین وەخت دەم‌وجهێ روێدانا کاری ئاشکەرا بکات ( هاوکاری ) .

## ئاوەڵناو لە رۆڵی ئادڤێربلدا

ئاوەڵناو لە نێو هەموو بەشەکانی دی ئاخافتن‌دا چالاکانە دەوری یەك جۆرە ئادڤێربل دەگێڕێت . کە ئەویش ئادڤێربلی چۆنیەتی‌یەو زۆر بە دەگمەن جۆرەکانی دی ئادڤێربل بەرچاو دەکەوێت . کە ئاوەڵناو رۆڵی بگێڕێت . لەوانە ئادڤێربلی کاتە . وەك ئەم وێنانەی خوارەوە :

حالا قەرۆمالا رەشۆزوودا دژمنی هەڤ بون ( دەستی دێ ـ ١٥ ) ئازاد درەنگ لە خەو هەستا .

خواخوام بوو زوو بگەمەوە جێ . ( جەمیلە ـ ٥٩ )

ئاوەڵناو بە زۆری لە گێرانی دەوری ئادڤێربلی چۆنیەتی بەکاردێت . کە جۆری رووودانی رووداو و بەسەرهات روون و ئاشکرا دەکات‌و دەکەوێتە پێش گوزارەوە :

ئەویش گەیشتە بەردەلانەکە لەوێ بۆ خۆی رەق راوەستا ( ئەفسانەی چیای ئاگری ـ ٨٦ ) .

بە سەر شۆستەکەدا وورد وورد ئەرۆی ( گوڵە نێرگزی کوردستان ـ٤٤ )

ته خه‌باتا خوه باش كر ( زمانى كوردى . ٦٩ )
ئه‌م زه‌عف رند زانن كيه باقى كولك ( سيابه‌ندو خه‌جى ـ٤ ) .

ئه‌و ئاوه‌لنـــاوه‌ى ده‌ورى ئادڤێربلى چۆنيـــه‌تى ده‌گێرێ هێندێك جار ده‌كه‌وێته دواى گوزاره‌وه . وه‌ك ئه‌م وێنه‌يه‌ى خــواره‌وه . كه ( كروبێ ده‌نگ ) ئاوه‌لنـــاوه‌و كه‌وتۆته دواى گوزاره‌كه‌وه :

جـــه‌ميله‌ش وه‌كو خۆى بوو . لـــه‌گه‌ل داينـــاردا پێكه‌وه

وه‌ستابوون كرِوبێ ده‌نگ ( جه‌ميله ـ ٥٨ ) .

**ئه‌نجـــام :**

ئاوه‌لناو له رووى ئه‌و رۆله‌سينتاكـــسى‌يانه‌ى ، كه لـــه رسته‌دا ده‌يان‌گێرێ به به‌شێكى چالاكى ئاخافتن ده‌ژمێردرێ . له دياليكتى كرمانجى خواروو‌و دياليكتى كرمانجى ژووروودا ئاوه‌لناو چ ساده‌بێ‌و چ نه ساده ده‌ورى به‌شه‌كانى سه‌ره‌كى رسته كه نيهادو گوزاره‌نو به‌شه‌كانى نا سه‌ره‌كى رسته ، كه به‌كار . ديار خه‌رو ئادڤێربلن ده‌گێرێ .

كاتێ كه به‌شه‌كانى سه‌ره‌كى‌و نا سه‌ره‌كى رسته برێتى ده‌بن له ئاوه‌لناو ئه‌م به‌شـانه هه‌ميشـه له يه‌ك دۆخى سينتاكسى‌دا ده‌بن . كه ئه‌ويش دۆخى راسته‌وخۆيه . هه‌روا هيچ جۆره ئامرازێكى سينتاكـــسى هاوبه‌شى گێرانى رۆله سينتاكـــسى‌يه‌كانى رسته ناكه‌ن . كاتێ كه برێتى ده‌بێت له ئاوه‌لناو . ته‌نيـــا له يه‌ك رۆلدا نه‌بێ ئه‌ويش له رۆلى ئادڤێربل‌دايه .

هۆى نه‌بوونى هيچ جۆره دۆخێكى سينتاكـــسى . كه بــــه هۆيه‌وه ره‌سه‌ن پيشان ده‌درێ ، بۆ ئه‌وه ده‌گه‌رێته‌وه . كـــه وا ئاوه‌لناو ئه‌و جه‌شنه ئاخافتنه‌يه ، كه هيچ نيشانه‌يـــــه‌ك وه‌رناگرێ ئه‌و نيهـــاده‌ى . كه برێتى ده‌بێ له ئاوه‌لناو . لـــه زمانى كوردى‌دا كه‌مه‌و هه‌ميشـه‌ش ده‌كه‌وێته پێش گوزاره‌وه. به‌لام رۆلى ئاوه‌لناو له گوزاره‌ى ناوى كارى‌دا چالاكه .
ئاوه‌لناو له رۆلى به‌ركاريش‌دا كه‌م به كاردێك . چالاكترين ده‌ورى . كه ئاوه‌لناو له نێو به‌شه‌كانى رسته‌دا ده‌يگێرێ ده‌ورى ديارخـــه‌ره‌و به هۆى ئـــامرازى خستنه ســـه‌ره‌وه بـــه نيوه‌ى ديارخراوه‌وه ده‌به‌سترێت .

ئه‌مه له‌و بارانه‌دا. كه ده‌كه‌وێته دواى ناوى ديارخراوه‌وه. به‌لام ئاوه‌لناوى پله‌ى بالا . كه به يارمه‌تى نيشانه‌ى ( ـ ترين ) دارێژراوه . كاتێ ده‌ورى ديارخه‌ر ده‌گێرێت به پێش نـــاوى ديار خراوه‌وه ده‌كه‌وێته‌و به هۆى پێوه‌نـــدى لێكـــده‌رى سينتاكـــسى‌يه‌وه به ناوى ديارخراوه‌وه پێوه‌ست ده‌بێت .

هه‌روا له‌م لێكۆلينه‌وه‌يه‌دا ئه‌وه‌مان بۆروون ده‌بێتـــه‌وه . كه‌وا هيچ جۆره جياوازى‌يه‌كى سينتاكسى له به‌كارهێنـــانى ئاوه‌لناو له رۆلى به‌شه‌كانى رسته‌دا لــــه نێوان دياليكتى كرمانجى خواروو‌و كرمانجى ژووروودا به‌رچاو ناكه‌وێته‌و ئه‌و ديارده‌يه‌ى . كه له گێرانى ده‌ورى ديارخه‌ردا له‌گه‌ل ئاوه‌لناوى پله‌ى بالادا به‌رچاو ده‌كه‌وێت وا به‌لێك نێزيك بوونه‌وه‌ى ئـــه‌م دوو دياليكته . ياسايه‌كى هاوبه‌ش پێك ده‌هێنن .

**سه‌رچاوه‌و په‌راوێز :**


**١ ـ نورى عه‌لى ئه‌مين . رێزمانى كوردى . سلێمانى ـ١٩٦٠ـ ١١١ ـ ١٤١ .**

**٢ ـ د. قه‌ناتى كوردۆ . زمانى كوردى . مۆسكۆ ـ ١٩٦١ـ ٢٨ ـ ٣٠ .**

**٣ ـ د. قه‌ناتى كوردۆ . رێزمانى كوردى ـ مۆســـــكۆ ـ لينينگراد ـ ١٩٥٧ ـ ١٢٦ ـ ١٣٧ .**

**٤ ـ د. قه‌ناتى كوردۆ . رێزمانى كوردى بــــه كه‌ره‌سته‌ى دياليكتى كرمانجى ژووروو‌و سۆرانى . مۆسكۆـ١٩٧٨ـ ٧٨ ـ ٨٢ . ئه‌م بابه‌ته‌ى پێوه‌ندى به باسه‌كه‌مانه‌وه هه‌يه وه‌رگێراوه‌ته‌وه سه‌ر زمانى كوردى و له لاپه‌ره ٦ ـ ١١ گۆڤارى رۆشنبيرى‌نوێ . ژماره ـ ٧٩ى ئادارى ١٩٨٠دا بلاو كراوه‌ته‌وه .**

**٥ ـ ئا. سمير نۆڤا . ك. ئه‌يوبى . دياليكتى كوردى موكرى. لينينگراد ـ ١٩٦٨ ـ ١٣١ ـ ١٣٧ .**

**٦ ـ دكتۆر ج.خ. به‌كاييف. زمانى كورده‌كانى ســــۆڤێت . مۆسكۆ ، ١٩٧٣ .**

**٧ ـ مه‌به‌ست له بارى چه‌سپيو . ئه‌و باره‌يه . كه ئاوه‌لناو له گوزاره‌ى ناوى ـ كارى‌دا به پێش ( بوون ) ده‌كه‌وێت . روون‌كردنه‌وه‌ى زێتر بروانه ( كوردستانى موكريانى) ناو له رسته‌ى كوردى‌دا . زانكۆ . ژماره‌ ١ .به‌رگى‌ـ٧.**

**٨ ـ سه‌رچاوه‌ى پێشوو .**
**٩ ـ ده‌رباره‌ى جۆره‌كانى ئامرازى خستنه سه‌ر له دياليكتى كرمانجى ژووروودا . بروانه . د. كوردستان موكريانى. ئامرازه‌كانى خستنه سه‌ر له زمانى كوردى‌دا . ژماره ـ١ به‌رگى ـ٤ـ ١٩٧٨ لاپه‌ره ١٤٥ـ١٧٥ ، گۆڤارى زانكۆ .**

**١٠ـ بروانه : ئاوه‌لنێو له دياليكتى كرمانجى ژووروو و خوارووداا . نووسينى دكتۆر قه‌ناتى كوردۆ و وه‌رگێرانى د. كوردستانى موكريانى . رۆشنبيرى نوێ ـ ژماره‌ـ٧٩ ئادارى ١٩٨٠ لاپه‌ره ( ٦ ـ ١١ ) .**

# زمانی مرۆڤ و زمانی گیان لەبەری تر

محمد معروف فتاح

مامۆستای کۆلیجی ئاداب / بەشی کوردی

1 — چاو پیا خشاندنێک بە فۆلکلۆری میلەتاندا ئەو راستیەمان بۆ دەردەخات کە هەر زۆر لە کۆنەوە مرۆڤ باوەڕی بەوە هەبووە کە تەنیا خۆی تاکە زیندەوەر نیە بتوانێت بدوێت و مەبەستی خۆی بەهۆی زمانەوە دەربڕێت ، بەڵکو هەندێک گیان لەبەری تریش ئەو توانایەیان تیادا بەدی دەکرێت . نەك هەر ئەمە بەڵکو لەوەش دەچێت مرۆڤ باوەڕی بەوە بوو بێت کە «زمانی» هەندێك زیندەوەری تر (هەروەك زمانەکەی خۆی) لەسەر پاسایەکی واتایی و دەنگی و ڕێزمانی دیاری کراو دەڕوات بەوەدا کە هەندێک ئادەمیزاد وەکو «سلێمان» و (سیگ فرید) وەك دەڵێن توانای فێربوونی زمانی زیندەوەریان هەبووە . جگە لەمەش لەسەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا ناو بەناو فەرهەنگی فەرەنسی ـ فەل یان ئنگلیزی ـ مەیمون دەکەوتە بەردەست [1] .

2 — لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لەساڵەکانی 1920 بەدواوە ئەم جۆرە بۆچوونانە تەواو خرانە پشت گوێ بەتایبەتی لەبەر ئەوەی زمانەوانی ئەو سەردەمە بەو تەکنیکە کۆنەیەوە نەی دەتوانی بەجۆرێکی زانستیانە لە دیاردەیەکی وەك «زمانی زیندەوەری تر» بکۆڵێتەوە ، زمانەوانیش وەك زانستێك دەبوایە خۆی لەبابەتی وا «نازانیارانە» دوور بخستایەتەوە تاوەکو پەردە ـ زانستیەکەی لەسەر رانەماڵرێت ، بەتایبەتی چونکە ماوەیەکی کورت بوو ئەم پایەی وەرگرتبوو ، زۆر بەتەنگیەوە دەهات و ئامادە نەبوو لەپێناوی بابەتێکی وادا خۆی بخاتە بەر پلارو لەنرخی «زانستیانەی» خۆی کەم بکاتەوەو

2 — جارێکی تر بهێنەوە ریزی بابەتە زانستیەکان .هەر لەبەر ئەم هۆیانە کە دەبینین ئەو پێناسانەی لەم سەردەمە بۆ « زمان » دەخرانە بەر چاو ، بەتایبەتی هی زمانەوانە ئەمریکایەکان ، کەم و زۆر پەنجەیان بۆ پەیوەندی زمانی

مرۆڤ و زمانی زیندەوەری تر درێژ نەدەکردو بەلایدا نەدەهاتن . زۆربەشیان زۆر بە ئاشکرا بۆئەوە دەچوون کە «زمان» بەتایبەتی هی «مرۆڤە» و مۆری هیچ زیندەوەرێکی تری پێوە نیە . بەبیروڕای زۆربەی ئەم زمانەوانانە قیژەو بانگی گیان لەبەری تر پایەی «زمانی» نابێت بدرێتی (هەرچەندە هیچ هۆیەکی ڕەوایان بەدەستەوە نەبوو) . بۆ ئەوەی تەواو لەهەڵوێستی ئەم زمانەوانانە بگەیی ئەین والەخوارەوە چەند پێناسەیەکی ئەو سەردەمە دەخەینە روو :

(1) «زمان هۆیەکی ناغەریزی تایبەتی بە مرۆڤ بەکاری دێنێ بۆدەربڕینی بیروهەست و ئارەزوو ، بەهۆی ڕەمزی دەنگیی لەسەر یاسا رووشتووەوە کار دەکات و لەژێر «ئیرادە دایە»(ئێدورد ساپیر) .

• (2) زمان بریتی یە لە چەند ڕەمزێکی لە خۆوە کە بە هۆیەوە کۆمەڵ دەتوانێت هاریکاری بکات» ـ (بلۆك و تراگەر) .

(3) «زمان کۆمەڵە ڕەمزێکی دەنگیی لەخۆوە یە کە بەکار دێت یان دە توانرێت بەکار بێت لە لایەن مرۆڤەوە بۆ لەیەکتر گەیشتن و پۆلکرنی شت و رووداوەکانی دەورووبەری» ـ (جۆن کارۆل) .

هەموو ئەو پێناسانەی سەرەوە ، بەنهێنی یان ئاشکرا ، رێکن لەسەر ئەوەی کە گوایا زمان مافی مرۆڤە بەتەنیا ، هۆیەکی ناغەریزییە کە مرۆڤ دەتوانێت بۆ لەیەکتر گەیشتن ، هاریکاری یان دەربڕینی هەست و ئارەزوو بەکاری بهێنێت . بە واتایەکی تر ، بەلای ئەم زانایانەوە زمان هۆیەکە بۆ جیاکردنەوەی مرۆڤ لە زیندەوەری تر . ئەم باوەڕەش ماوەیەکی زۆرەو تا ئێستاش لەکارە زمانەوانیەکاندا دووپات دەکرێتەوە .

3 — هەموو ئەو زانایانەی باوەڕیان بەوە هەیە کە زمان زیاتر لە هەموو هۆیەکی کەلتووری تر مرۆڤ لەگیان لەبەری تر جیا دەکاتەوە ، راستیەکی گەورەیان خستووتە پشت گوێ ئەویش ئەوەیە کە زمانی مرۆڤ لە زۆر سەرەوە لە قیژەو بانگی زیندەوەری تر دەچێت ، ئەوەندە ناوکۆیان زۆرە کە لەبەراورد کردن دێن و بگرە جیاوازی نێوانیان تەنیا لە «پلە» دایە نەك لە «جۆر» وەك بەم بەراوردەی خوارەوەدا بۆمان دەردەکەوێت :

(أ) زمانی مرۆڤ لەسەر بناغەی فۆنیم کاردەکات ، بەواتای ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت ژمارەیەکی زۆر دەنگ دەربکات ، بەلام ژمارەیەکی زۆر کەم لەم دەنگانە بەکار دێت بۆ جیاکردنەوەی واتا (بۆ قسە کردن) . بەم دەنگە گرنگانە دەوترێت «فۆنیم» ژمارەیان لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێت . وەکو بۆمان دەرکەوتووە ژمارەی ئەم فۆنیمانە لە زمانی مرۆڤدا لەنێوان (11) و (67) دایە . بێگومان کەم و زۆری ژمارەی ئەم فۆنیمانە گرنگ نیە لەزماندا ، چونکە لەم ژمارە کەمە دیاری کراوە ، مرۆڤ دەتوانێت ژمارەیەکی بێ سنوور وشەو رستە دەربکات بەهۆی «لێکدانەوە» . (هەر لەبەر ئەمەشە کە ناتوانین بڵێین زمانێك لە زمانێکی تر پێش کەوتووترە ، چونکە هەموو زمانێك دەتوانێت ئەم کەرەسە بنچینەیە بەکار بهێنێت بۆ پۆلکردنی دەورووبەر ، لەسەر یەکێك لە «ئاستەکانی» زمان : وشە یان فریز یان رستە . بۆنموونە ئەو دیاردەیەی کەزمانێك لەئاستێکدا دەری دەبڕێت لەوانەیە زمانێکی هەر هەمان دیاردە لەئاستی تردا دەربڕێت) . [*]

قیژەو بانگی زیندەوەری تر وەك لێکۆڵینەوەی زانستی بۆمانی دەرخستووە دیسانەوە وەك زمانی مرۆڤ بەندە بە «فۆنیمەوە» ، بەواتای ئەوەی کە بانگ و قیژەی زیندەوەری تریش دەتوانرێت شی بکرێتەوەو کەرت بکرێت بۆ چەند پارچەیەك دەنگی بنچینەیی (فۆنیم) کە لەقیژەو هاواری تردا خۆیان دووپات دەکەنەوە . ژمارەی ئەو دەنگە بنچینەیانەش لەبانگی زیندەوەری تردا لەنێوان (7) و (37) دایە .

کەواتە زمانی مرۆڤ لەگەڵ بانگی زیندەوەری تردا لە بەراورد کردن دێت ، چونکە وەك لەسەرەوە روون بوەوە ، هەردووکیان کەڵك لە «فۆنیم» وەردەگرن . دیسانەوە لێرەشدا دەبێت ئەو ڕاستیەمان لەیاد نەچێت کە زۆرو کەمی فۆنیمەکان کەم وزۆر پەیوەندی بە «دوا کەوتوویی» یان «پێش کەوتوویی» زمانەوە نیە ، فۆنیم زۆری ئەوە ناگەیەنێت کە زمانەکە لەڕووی کۆمەلایەتیەوە ئەرکی زیاتری بەسەرەوەیە ، هەروەك کەمی

فۆنیمیش لە لێهاتوویی زمانەکە کەم ناکاتەوە . تەنیا لەبەر ئەوەی بانگو قیژەی زیندەوەری تر لەگەڵ زمانی مرۆڤدا هەردووکیان کەڵك لەفۆنیم وەردەگرن ئیتر نابێت وا تێبگەین کە هەردووکیان لەیەك پلەدان ، ئاشکرایە کە زمانی مرۆڤ «پێشکەوتوو - ترە» (بەواتای ئەوەی گەورەتر کۆمەڵایەتی زۆرتر بەسەرشانەوەیە) چونکە لەزمانی مرۆڤدا فۆنیمەکان زۆر بە ئاسانتر لەیەك دەدرێن و بیری نوێیان پێ دەردەبڕێت . ئەم توانای لەیەکدانە کە هەق بۆ کەم وزۆری فۆنیمەکانیش دەکاتەوە لەبانگو قیژەی زیندەوەرەکانی تردا زۆر کەم هێرەو ئەرستۆ هەزارەها ساڵ لەمەوبەر بەتەواوی ئەم جیاوازییەی نێوان زمانی مرۆڤ و زمانی زیندەوەری تری دەرخستووە .

ب - هەرچەندە وا بەبیردا دەهات کە بەکار هێنانی رەمز تەنیا لەزمانی مرۆڤدا هەیە ، لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییە

روونی کردۆتەوە کە «رەمز» ، بەهەموو جۆرەکانیەوە لە بانگو قیژەی زیندەوەری تریشدا هەیە . مەبەست لەرەمز لێرەدا «نیشانەیەکە» کە «واتایەك» یان «گرنگیەکی» درابێتی . وەك بەم پێناسەدا دەردەکەوێت رەمز هەموو کاتێك دوو دیوی هەیە : نیشانە (کە لە زماندا دەنگ دەگرێتەوە) و واتای نیشانەکە . رەمز لەراستیدا بریتی یە لە یەککگرتنی هەردوو دیوەکە ، نیشانەو واتاکەی . بەپێی پەیوەندی ئەم دوو دیوەی رەمز ، سێ جۆر رەمزمان هەیە :

(1) رەمزی سروشتی (2) رەمزی وێنەیی (3) رەمزی لە خۆوە .

مەبەست لەرەمزی سروشتی ئەو رەمزانەن کە یەکێك لە دیوەکانی لە ئەنجامی دیوەکەی تریەوە دێتەکایەوە ، بە واتایەکی تر ، پەیوەندی نێوان فۆرم وواتاکەی پەیوەندییەکی هۆییە وەك پەیوەندی نێوان «وەنەوزدان» و «خەواڵوویی» یان «هەور» و «باران» یان «سەرما» لەگەڵ «نزم بونەوەی پلەی گەرما»

یان «لافاو» لەگەل «بەرزبونەوەی ئاستی ئاو» . ئەم جۆرە رەمزە بەمرۆڤ دروست ناکرێت ، بەڵکو مرۆڤ هەر توانای ئەوەی هەیە کە وەکو دیاردەیەکی سروشتی لێکیان بداتەوەو پەیوەندێیکەیان دیاری بکات .

رەمزی وێنەیی هەروەك بەناوە کەیا دەردەکەوێت ئەو رەمزانەن کە تیایاندا فۆرمو واتا لەیەك دەچن یائەم لەیەکچوونەیان لە واقیعیشدا هەیە یان خەڵکی وای بە بیرا دێت کە هەیە . رەنگی سوور ، بۆ نموونە ، لە نیشارەی هاتوچۆدا بەواتای «مەترسی» و «وەستان» دێت چونکە «سوور» رەنگی «خوێن» یان «ئاگرە» ئەم دووانەش هەر کاتێك بەر چاو کەوتبن «مەترسیەك» لە ئارادا هەبووە . لێرەدا لە یەکچونێك هەیە لە نێوان «سور» و «خوێن» دا ، ئەم لەیەکچوونەش جارێکی تر گواستراوەتەوە بۆ نێوان «رەنگی سوور» و «مەترسی» یان «وەستان» . لەرەمزی وێنەییدا پەیوەندی نێوان فۆرمو واتا وەکو نێوان «وێنە» و «وێنەگیراو» وایە . بەپێچەوانەی جۆری یەکەمەوە ، ئەم جۆرە رەمزە لە داتاشینی مرۆڤ خۆیەتی .

رەمزی لە خۆوە ئەو جۆرانەن کە نەك تەنیا هیچ لە یەکچوونێك لەنێوان فۆرمو واتادا نیە بەڵکو هیچ جۆر پەیوەندییەك نایان لکێنی بەیەکەوە . بۆ نموونە هیچ جۆرە هۆیەك پاڵ بە مرۆڤەوە نانێت کە ئەم نیشانەیە ( $\sqrt{\ }$ )لە بیرکاردا بۆ «رەگ» دانێت ، هەروەها هیچ هۆیەك نیە وای لە کورد کردبێت بەپیاو (مرۆڤ) بڵێت «پیاو» (وشەکە) یان بەگیانلەبەر بلێت «زیندەوەر» . لە هەمان کاتدا لەم جۆرە رەمزانەدا کۆمەڵ نەك تاکە کەس ، پەیوەندی فۆرمو واتا رادەگرێت ، لەبەر ئەمەیە کە تاکە کەسێك بە تەنیا ئەگەر وشەیەکی نوێ داتاشێت ، ئەو «بەرهەمە» مەرج نیە ببێتە پارچەیەك لە کەرەسەی ئەو زمانە ، تاوەکو زۆربەی ئەو خەڵکەی کە بەو زمانە قسە دەکەن پەسەندی نەکەن . کەواتە رەمزی لە خۆوەوە کۆمەڵ دای دەتاشێت ، لێکی دەداتەوەو ڕای دەگرێت بەهۆی جۆرێك لە «رێك کەوتن» لە نێوان قسە پێکەرانی زمانێکی دیاری کراودا .

**زمانی مرۆڤ بەزۆری هەر رەمزی لە خۆوە بەکار دێنێت . تەنانەت ئەو رەمزانەش کەوا بەبیردا دێت کە لەبنچینەدا لە لاسایی کردنەوەی چەند دیاردەیەکی سروشتیەوە هاتوو نەتە کایەوە وەك «حەپە» یان «قڕە» - (وشەی سروشتی) رەمزی**

وینەیی نین ، هەر چەند سەرزاری لەم جۆرە رەمزە دەچن یان نزیك دەبنەوە . ئەم رەمزانە نابێت بە «وێنەیی» دابنرێن چونکە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێن .

بانگو قیژەی زیندەوەری تریش کەڵك لە دوو جۆر رەمز وەردەگرێت : رەمزی وێنەیی‌و رەمزی لە خۆوە ، بەڵام بە پێچەوانەی زمانی مرۆڤەوە ، بەزۆری پشت بەرەمزی وێنەی دەبەستێت‌و زۆر کەمتر رەمزی لە خۆوە بەکار دێنێت . بۆ نموونە رەوشتی زیندەوەرێکی وەك کەڵەشێر پێش ئەوەی بکەوێتە شەڕەوە (باڵ فش کردن ، پۆپنە بەرزکردنەوە ، سووڕانەوە بە دەوری خۆیدا) جۆرێکە لە رەمزی وێنەیی هەمان کەڵەشێر کە دوو دڵ بێت لە شەڕیان بیەوێت هەڵ بێت خۆی خەریك دەکات بە گەڕان بەدوای داناو دەنووك لە زەوی دەدات ، هەر وەکو خەریکی خواردن بێت کەچی تەواو ئاگای لە دوژمنەکەیەتی‌و چاك خۆی ئامادە دەکات بۆ بەرهەڵستی . رەوشتی وا بەگشتی بە کارهێنانی رەمزی لە خۆوەیە چونکە هیچ پەیوەندییەك ـ لە یەکچوون یان هۆ ـ نیە لە نێوان «گەڕان بە دوای دانا» و «خۆ ئامادە کردن بۆ شەڕ» ، بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو ئەم جۆرە زیندەوەرانە لە هەڵوێستدا هەمان رەوشتیان هەیەو هەمووشیان لە یەکتری تێ دەگەن‌و بەهەڵە ناچن (هەمان واتا دەدەن بەو رەوشتە) کە واتە ئەم کۆمەڵە «رێك کەوتوون» لەسەر ئەوەی ئەم «جولانەوەیە» بەو «واتا» یە بێت ، هەروەك چۆن مرۆڤی کورد رێك کەوتوون لەسەر ئەوەی بە «پیاو» ـ مرۆڤ ـ بڵێن «پیاو» (وشەکە) .

وەك لەسەرەوە بۆمان روون دەبێتەوە «رەمز» تایبەتی نیە بۆ زمانی مرۆڤ . زمانی زیندەوەری تریش «رەمز» بەکار دێنێت بەهەموو جۆرەکانیەوە . تاکە جیاوازی لە نێوان زمانی مرۆڤ‌و زمانی زیندەوەری تردا لە رووی رەمزەوە لەوەدایە کە زمانی مرۆڤ بەزۆری رەمزی لە خۆوە بەکار دێنێت ، بەڵام بانگو قیژەی زیندەوەری تر بە پێچەوانەوە بە زۆری رەمزی وێنەیی بەکار دێنێت‌و رەمزی لە خۆوە (هەر چەندە لە بانگو قیژەیاندا هەیە) زۆر کەم بەکاردێت . کەواتە دیسانەوە جیاوازی نێوان دوو زمانەکە لە «پلە» دایە نەك لە «جۆر» .

دەبێت لێرەدا پەنجە بۆ ئەو راستیە ڕاکێشین کە بەکار هێنانی رەمزی وێنەیی‌و پشت نەبەستن بەرەمزی لەخۆوە ، زیانێکی زۆری بەزمانی زیندەوەری تر گەیاندووەو تەواو لەچالاکی‌و توانای کەم کردۆتەوە ، چونکە ئەو جۆرە رەمزە وەك رەمزی لە خۆوە بە ئاسانی لە «وێنە گیراو» واتا نابێتەوەو کەرت ناکرێت تا وەکو لەگەڵ پ[illegible]چەی تردا لەیەك بدرێت‌و رەمز یان نیشانەی نوێمان بداتێ . لەبەر ئەمەیە کە زمانی زیندەوەری تر دەستەوسانە بەرامبەر هەڵوێستی نوێ‌و ژمارەی ئەو بیرانەی کە بەهۆیەوە دەردەبڕێت زۆر کەمەو سنوورێکی تەسکی هەیە . زمانی مرۆڤ ، بە پێچەوانەی ئەمەوە بێ دەسەڵات نیە بەرامبەر هەڵوێستی نوێ‌و دەتوانێت هەموو مەبەستێك دەربڕێت ، تەنانەت گەر مەبەستەکەش تەواو نوێ بێت‌و لەمەوپێش نەبووبێت ، چونکە نیشانەی لە خۆوە بەکار دەهێنێت‌و ئەمانەش لە هەڵکەوتدا توانای ئەوەیان هەیە لەت‌بن‌و یەك بگرن لەگەڵ نیشانەی تردا بۆ دەربڕینی نوێ .

ئەم توانایەی زمانی مرۆڤ ، توانای داهێنان ، لە کاتێکدا تەواو هەستی پێ دەکرێت کە زمانێك پێویستی بە وشەیەکی نوێ بێت بۆ دەربڕینی بیرێکی نوێ . لەکاتی وادا هەندێ جار وشەیەکی «تاریك» خۆی دەکات بە زمانەکەداو خەڵکی لەسەر واتاکەی رێ دەکەون ، بێ ئەوەی ئەو وشەیە هیچ پەیوەندییەکی هەبێت لەگەڵ وشەی تردا ، بەڵام زۆربەی جار ، هەر لە کەرەسە کۆنەکە وشەیەکی نوێ وشەیەکی نوێ پێك دەهێنرێت بۆ دەربڕینی ئەو بیرە نوێیە . زمان لەبنچینەدا بەم شێوەیە دروست بووەو هەر بەم رێگایەش گەشەی کردووەو مەبەستیشمان لە «کەرت کردن» و «لێکدانی» رەمزەکان هەر ئەیە . سەرنجێکی کەم لەچەند وشەیەکی زمانی کوردی دیاردەی کەرت کردن‌و لێکدانمان زیاتر بۆ روون دەکاتەوە . گریمان مرۆڤێکی کورد لە قوناغێکی بوونیا

وشـەی «سـوتـانـدن»، و «گـەنـدان بـۆمیـوە»، و «هـەڵ کڕوزاندن»ی زانیوە . هەروەها لە فەرهەنگی بیریشیدا وشەی «بۆن کردن» هەبـووە کاتێـك ئەو مـرۆڤە تـوشی هەڵوێستێ هاتبێت کە تیایدا پێویست بـووبێت دیاردەی «بۆن کردن»، لەهـەمان کـاتدا لەگـەڵ دیاردەکـانی تردا (سوتاندن ، گەندان ، هەڵ کڕوزاندن) بەکار بهێنێت ، زمانەکەی ، لەبەر ئەوەی ڕەمزەکانی لەخۆوەن ، ڕێگەی ئەوەی داوەتێ کە بەهەر جۆرێك بێت ئەم بیرە نـویانـە دەربڕێت و بەم شێوەیە «بۆنی سوتاندن» ، «بۆنی گەندان» و «بۆنی هەڵ کڕوزاندن»، هاتووتە کوردیەوە . بێ گومان ، لێکدانی وشە بەم جۆرە سادەیە (هەر وشە دانە پاڵ یەك) لە توانا و چالاکی زمان کـەم دەکاتـەوە ، لەبەر ، ئـەوە زۆربەی کات دارشتنی ڕۆنانی نوێ نەك هەر «درانە پاڵ» «بەڵکو» «کەرت کردنیشی» تێ دەکەوێت ، بەمەرجێك ئەم کەرت کردن و لێکدانە نەبێتە هۆی دروست بوونی تـەم و مژی واتایی و سەر لێ تێك دان . بەم جۆرە «بۆنی سوتان» دەبێتە «بۆسۆ» و «بۆنی گەندان» دەبێتە «بۆگەن» و «بۆنی هەڵ کڕوزاندن» دەبێە «بـۆکڕوز» . ئـەم کەرت کـردن و (بـۆ / ن ، هەڵ / کـڕوز / آندن ، سـو / آنـدن) و دانەپاڵ و (بۆ + کڕوز) و گۆڕانە دەنگیانە (سـوو سۆ) کـاتێك ڕوو دەدات کـە سەر لێ تێـكدان لە زمانـەکەدا دروست ناکات (بەواتایەکی تر هەر ئەو ڕۆنانە بە واتا دژ بەمە لە زمانەکەدا نەبێت) .

بێ گومان دەبێت ئەوە بزانین کە مەبەست لە «لە یەکدان» لە زماندا تەنیا ئەوە نیە کە ڕۆنانمان بۆ ئاسانتر بکات تا وەکو بە ئاسانتر بوترێت و باشتـر بەدەمـابێت ، بەڵکو مەبەستی هەر گەورە لە بەکارهێنانیا ئەوەیە بەهۆی کەرت کردن و لێکدان و گۆڕانەوە ، بارچە کەرەسەی خامی ترمان دەست کەوێت تا وەکو بۆ کاتی پێویستی وشـەی تری لێ داتاشین بە پێ ی یاسای زمانەکە . لەو لێکدانانەی سەرەوەدا ، بۆ نموونە ، ئەو پارچانەی (مۆرفیمانەی) کە ماونەتەوە وەکو (ـ ن) یان (ـ آندن) کەڵکێکی گەورەیان لێ وەرگیراوە بەوەی یەکەمیـان بۆتـە نیشانـەی چاوگ و دووەمیان بوە بەنیشانە بۆ کاری تێپەر .

ج ـ زمانی مرۆڤ و زمـانی زیندەوەری تـر لە سەرێکی تـریشەوەلەیـەك دەچن . هەردوکیـان بـۆ گـەیـانـدنی مەبەستەکە لەدووشتدا کۆدەبێتەوە : گەیاندنی هەست و پۆلکردنی دەووروبەر . کە دەڵێین ئەرکی هەردوو زمانەکە «گەیاندنی زانیاری»، و «لەیـەك گەیشتنـە»، مەبـەستمان ئەوەیە کە هەردوکیان لە «کۆمەڵ» دا بەکار دێن و بەلای کەمەوە بۆ تێ گەیشتن لییان پێویستمان بە دوو ڕۆڵە : ڕۆڵی قسەکەر و ڕۆڵی گوێ گر . زۆربەی کات بۆ هەریەکێك لەم ڕۆڵانە پێویستمان بە کەسێك دەبێت ، بەلام هـەردوو ڕۆڵەکـەش هەنـدێ جار(کـاتی قسە لەبـەر خۆمـانـەوە دەکەین) بەیەك کەس دەبینرێت .

لێرەشدا دیسان دەبینین کـە هەر دوو زمـانەکـە (زمانی مرۆڤ و زمانی زیندەوەری تر)وە ك یـەكن و ئەو جیاوازییەی هەیە لە نێوانیاندا تەنیا جیاوازییەکە لەپلەی تواناکانیاندا . ئاشکرایە کە زمانی مرۆڤ زۆر بە تواناترە ، زۆر چالاکترە لە گەیاندنی هەست و زانیـاری دەربارەی دەوروو پشتی مرۆڤ . بە پێچەوانەی ئـەمەوە ، زمـانی زیندەوەری تر ، لەبەر ئەوەی بۆ هەر هەڵوێستێکی دیاری کراو «بانگێك»، یان «هـاوارێك» تـەرخان دەکـات و لەبەر ئەوەی «هەڵوێست»، و «بانگەکە»، جیانابنەوە لەیەکتری ، (بەواتای ئەوەی هەردوکیان لەیەککاترا دەبێت ئـامادە بن) توانای ئەوەی نیە دەربارەی ڕابردوو بدوێت یان باسی دوارۆژ بکات یان لە بارێکی ناواقیعی (خەیالی) بکۆڵێتەوە کە «ئەگەر»، و «کاشکی»، و «خۆزگەی»، تێ بکەوێت . زمانی زیندەوەری تر تەنیا بە «ئێستا»، وە ، بە «ڕانەبـردوەوە» بـەستراوەو دەربـارەی ئـەو شتـانـەن کـاتی «وتن»، لە دەوروبەردان .

د ـ هەر دوو جۆرە زمـانەکـە ، دیسان نـەك هەرپشت بـەڕەمز دەبـەستن ، بەڵکو لە هەردووکیـاندا نیشـانە دەنگیەکان ناکوێرانەو ڕێك وپێك خۆیان دووپات دەکەنەوە لەشـرێتی وتندا بـەمـەبـەستی زانیـاری گـەیـانـدن و لەیەکترگەیشتن .

ه ـ یەکێك لە تایبەتیە ناوکۆکانی هەردوو جۆرە زمانەکە لە

وەدایە کە رۆڵ گۆڕینەوەیان تێ دەکەوێت ، بەواتای ئەوەی ئەو زیندەوەرەی کە دەنگەکان دەردەکات توانای ئەوەشی هەیە دەنگەکان وەربگرێت و شییان بکاتەوەو تێیان بگات . بەم جۆرە «قسەکەر» هەمووکاتێك دەتوانێت ببێتە گوێگر بیستەر . بە پێچەوانەشەوە ، گوێگر بیستەر دەبێتە «قسەکەر»

و ـ لەهەر دوو جۆرە زمانەکەدا بەکارهێنانی رەمزەکان (وتن) دەبێتە هۆی دەرکەوتنی «رەوشتێکی» دیاری کراو لەگوێگردا ، ئەم رەوشتەش دەبێت لەگەڵ مەبەستو نامەی وتنەکەدا بگونجێت . هەر ئەم رەوشتەشە بۆمان دەردەخات کە لە یەکتر گەیشتن لە ئارادا هەیە .

ز ـ هەر دوو جۆرە زمانەکە رێگەی دەم / گوێ بەکار دێنن بۆ لە یەکتر گەیشتن . بە کارهێنانی ئەم رێگەیە لە دوو سەرەوە کەڵکی هەیە بۆ زیندەوەر : یەکەم : زیندەوەر پێویستی بە وزەیەکی زۆر کەم دەبێت تاوەکو فەناتەکە بخاتە ئیش (لەم روەوە بەراوردی قسە کردن بکە لەگەڵ راکردن ، هەستان ، خواردن ... هتد) ، دووەم : وتن یان قسە کردن رێگە لە چالاکی تر ناگرێتو بەم جۆرە زیندەوەر دەتوانێت لەکاتی راکردن ، خواردن یان هەستاندا قسە بکات .

**دەبێت ئەوەش بزانین کە رێگەی دەم / گوێ تاکە قەنات نیە لە ئارادا بۆ لەیەکتر گەیشتن (سەیرکردن ، دەست تێوەدانو رێگەی تریش هەیە) و رێکەوتیش نیە کە لە زیندەوەردا ئەم رێگایە پەسەند کراوەو گەشەی پێدراوە .**

ح ـ هەر دوو جۆرە زمانەکە خاوەنی یاسای رستەییو واتایی تایبەتی خۆیانن . بە واتایەکی تر رێز کردن ، خستنە پاڵ یەکتریو دانانی رەمزەکان هەر لە خۆوەو بێ یاسا نابن بەڵکو لەسەر رێو شوێنێکی تایبەتی دەروات . هەروەها بەهۆی ئەو رەمزانەوە زیندەوەر لە دەوروبەری خۆی دەکۆڵێتەوە .

ط ـ لەهەردوو جۆرە زمانەکەدا رەمزەکانی وتن پاش ماوەیەك لەدەم دەرچوون کۆتاییان دێتو جارێکی تر گوێگر بیستەر بۆی ناگەڕێتە دواوە . بەم جۆرە مێشکی قسەکەرو گوێگر ئەرکێکی گەورەی دەکەوێتە ئەستۆ ئەویش کۆکردنەوەیە . ئەگەر لەبەر ئەم ئەرکە گەورەیەی مێشك نەبووایە ، لەوانەیە مرۆڤ بیری لە داهێنانی نووسین نەکردایەتەوە .

ی ـ لە هەردووجۆرە زمانەکەدا بلاوبونەوەی دەنگە کان بە هەموو لایەکدایە (ئاراستە نەکراوە) . بەپێچەوانەوە وەرگرتنی دەنگەکان پێویستی بە ئاراستە کردنی گوێیە .

بە واتایەکی تر ، بۆ ئەوەی لەمەبەسی وتن بگەین پێویستمان بەگوێ گرتنە نەك «بیستن» . ئەم تایبەتیەش رێگەی دەم گوێ سەپاندوێتی بەسەر زیندەوەردا .

ك ـ لە هەردوو جۆرە زمانەکەدا ئەو زانیاریەی رەمزەکان دەیگەیەنن هەمووی بە یەکجار بە سەریەکەوە ناگەنە گوێ بەڵکو بەرەبەرە دێت . بەم جۆرە گوێگر ماوەی ئەوەندەی دەبێت کە مەبەستەکە یان نامەکەشی بکاتەوە . بێ گومان ئاگاداری ئەوەین کە شریتی دەنگەکانو ئاوازی وتن لەیەکتر جیانابنەوەو هەردوکیان بەیەکەوە دەکەنە گوێگرو دوو ئەرکی جیاواز دەبینن (ئاواز زیاتر شێوەی قسە کردن دەردەبرێت وەکو دوودڵی ، تەوس ، پرسیار ، گومان ... هتد) ، بەلام ئەم پێکەوە گەیشتنەیان ئەرکێکی وا قورس نیە بەسەر مێشکەوە کەوا بە راوردبکرێت لەگەڵ ئەو ئەرکەی بۆ نمونە چاو بۆمێشکی دروست دەکات بەوەی وێنەی دەها شت لە هەمان کاتدا دەنێرێت بۆ لێکدانەوە .

ل ـ لەهەردوو جۆرە زمانەکەدا قسە کەر ئاگاداری مەبەستی خۆیەتی دەزانێت چی وتوەودەتوانێت بەهۆی مێشکەوە دوای قسەی خۆی بکەوێتو بەجۆرێکی گونجاو وتنەکەی تەواو بکات . بەم جۆرە قسەکەر تەواو ئاگادارەو راستەوخۆ هەست بەوە دەکات گوێگر تێی دەگات ، گوێ لێیەتی ، قەناتی گفتوگۆ کراوەیە یان ناو بەپێی ئەم زانیاریە رەوشتی خۆی دەگونجێنێتو بۆ کێشەکە

دەچێت . بەهۆی ئەم ئاگادارییەوەیە کە قسەکەر دەتوانێت ئاگاداری هەڵەی قسەبێ‌و هەندێ جار لە ناوەڕاستی وتندا خۆی ڕاست دەکاتەوە (بە یەجگاری .... بەیەکجاری خۆمم رزگار کرد لەدەستی) .

دیسانەوە بەهۆی ئەم وریایی‌و چاودێرییەی گوێ‌و مێشکی قسەکەرەوەیە کە ساوا دەتوانێت قسەکانی خۆی لەبەر ئەوانەی دەوروبەری داتاشێت‌و بەم جۆرە خۆی فێری زمانەکەی یان زمانەکانی دەوروپشتی بکات .

٤ ـ بەم بەراوردەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە زمانی زیندەوەری تریش ئەگەر لە پلەی پێشکەوتوویی‌و چالاکیشدا وەك زمانی مرۆڤ نەبێت هێشتا هەردەبێت بەزمان دابنرێت چونکە لەبنەڕەتدا وەك یەکن : یەك کەرەسە بەکار دێنن ، یەك ڕێگە دەگرن ، بۆیەك مەبەست هەوڵ دەدەن . تەنیا جیاوازییەکە لە وەدایە کە زمانی زیندەوەری تر بۆ ئەوەی بگاتە پلەی زمانی مرۆڤ چەند تایبەتیەکی تری پێویستە . ئەم تایبەتیانەش راستەوخۆ پەیوەندییان بە ئەرکی یان کاری زمانەوە هەیە نەك چۆنیەتی هەڵکەوتی بایلۆجیانەی مرۆڤ. ئەو تایبە تیانەش ئەمانەن : ـ

(1) پەیوەندی نیشانەو واتا لەزمانی مرۆڤدا بەزۆری پەیوەندییەکی لە خۆوەیەو ڕەمزەکانی ڕەمزی لە خۆوەن بە زۆری هەرچەندە ڕەمزی وێنەیش هەندێ جار بەکار دێت . (بڕوانە بەشی 3 — ب) .

(2) لەزمانی ئادەمیزاددا گۆڕینی فۆرم دەبێتە هۆی گۆڕینی واتا . ئەم گۆڕانانە لە هەموو ئاستێکی زماندا هەیەو هەستی پێ دەکرێت : لەئاستی دەنگدا (فۆنیم) کاڵ / کار ، پەلە پەلە .... هتد ، لە ئاستی مۆرفۆلۆجیدا : شارە / شارەکە / شارێك / شارەکان .... هتد ، هەروەها لەئاستی رستەدا .

(3) لە زمانی مرۆڤدا ئەو شریتە دەنگەی لەدەم دەردەچێت دەتوانرێت کەرت بکرێت ، بەواتایەکی تر ، شریتە دەنگەکە بریتی‌یە لە دانەی زمان لەناو دانەی تری زماندا . بەم پێیە ، رستەی ئاڵۆز بریتی‌یە لەچەند رستەیەکی سادە ، رستەی سادە بریتی‌یە لە فریزی ناوو فریزی‌کار ، ئەمانەش لە وشە پێك هاتوون ، وشەش لە مۆرفیم ، و مۆرفیمیش لە فۆنیم ... هتد . ئاشکرایە کە ئەم دانانەی زمان هەریەکەیان لە ئاستێکدا کار دەکەن‌و (مۆرفیم لەئاستی مۆرفۆلۆجی‌و فۆنیم لەئاستی فۆنۆلۆجی ... هتد) هەریەکەیان «پلە» یەکیان هەیەو ئەو دانانەی پلەییان بەرزترە (رستە بۆنموونە) ناچنە ناو / یان نابنە بەشێك لەوانەی پلەییان نزمترە (هەرگیز رستە نابێتە بەشێك لە فریز بەلام بە پێچەوانەوە ئەمە روو دەدات بەواتای ئەوەی فریز دەتوانێت ببێتە بەشێکی رستە) .

(4) تایبەتیەکی تری زمانی مرۆڤ لە وە دایە کە ژمارەیەکی زۆر لەدانە پلە بەرزەکانی ئاستێکی دیاری کراوی زمان هەموو کاتێك کەرت دەکرێت‌و دەگۆڕێتەوە بۆ ژمارەیەکی کەمتر لەدانەی ئاستێکی تری نزمتر لەخۆی . بەم جۆرە رستە بێ سنورەکانی هەر زمانێك وەرگرین ، دەبینین پێك هاتووە لەچەند هەزار وشەیەك ، ئەم چەند هەزار وشەیەش لە سەدەها مۆرفم پێك هاتووە ، مۆرفیمەکانیش هەموویان لە ژمارەیەکی زۆر کەم فۆنیم پێك هاتوون (بڕوانە بەشی 3 — أ) . ئەمانەش لە ژمارەیە ك لە (تایبەتی جیاوازکەر) ( distinctive featwes) پێك هاتوون کە بەباوەڕی هەندێ زمانەوان ژمارەیان لە هەموو زمانەکانی مرۆڤدا لە (12) زیاتر نیە (یاکوبسن 19) . شایانی باسە کە ئەم لەت کردن‌و گۆڕینەوەیە زۆر تەواوە ، بە واتای ئەوەی «لە تەدانە» یان «پاشماوە» لە هیچ ئاستێکی زماندا نامێنێتەوە لەدوای گۆڕینەوە . دەبێت ئەوەش بزانین کە زمانی مرۆڤ بەهۆی «دانە» و «ئاست» «پلەی دانەکانەوەیە» کە توانیوێتی توانای «لە یەکدان» و «داهێنان» پەیدا بکات (بڕوانە بەشی 3

(5) زمانی ئادەمیزاد ، بە پێچەوانەی زمانی زیندەوەری ترەوە ، بەهۆی فێربوونەوە لەنەوەیەکەوە دەگاتە نەوەیەکی تر . هیچ بەڵگەیەکی زانیاری لەئارادا نیە بۆمان بسەلمێنێت کە منداڵ زمانی دایك‌و باوکی ئاسانتر فێردەبێت . منداڵ کەدێتە

دنیاوه ئەو توانایەی لەگەڵدایە کەفێری زمانێک یان چەند زمانێکی مرۆڤ ببێت بێ دیاریکردن .

5 — جگە لەم تایبەتیانە ، زمانی مرۆڤ چەند تایبەتیەکی تریشی هەیە کەوەك ئەمانە گرنگنین ، بەواتای ئەوەی ئەم تایبەتیانە ببن یان نەبن ، زمانێك مەرجەکانی تری تێدابێت هەر بەزمانی مرۆڤ دادەنرێت . لەم تایبەتیانە : «1» توانای شێواندن : زمانی مرۆڤ بەپێی ئارەزووی قسە پێکەرانی دەوروبەری پێ دەشێوێنرێت و درۆی پێ دەکرێت ، ئەم توانایەی زمان راستەوخۆ پەیوەندی هەیە لەگەڵ دانانی چیرۆك و هەڵبەستدا .

«2» توانای راستی دە ربرین : زمانی مرۆڤ بەگشتی ئەو توانایەی هەیە کە ڕاستی پێ دەربرێت ، هەر زمانێك ئەو توانایەی زمانێك ئەو توانایەی نەبێت «زانیاری» پێ تۆمار ناکرێت .

«3» توانای «خۆ» دەربرین : زمانی مرۆڤ رێگە دەدات بە قسە پێکەرەکانی کە بە ئارەزووی خۆیان لە زمانەکە خۆی بکۆڵنەوەو پێی بدوێن . زمانێك ئەم توانایەی نەبێت ، زمانەوانی و فەرهەنگ و فەلسەفەی پێ نانووسرێت .

«4» توانای وەرگێران : زمانی مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە وەربگێڕیتە سەر زمانی تر یان زمانی تر وەرگێرێتە سەرخۆی .

5 — ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەم دواییەدا دەربارەی زمانەکانی گێتی کراوە ، بەتایبەتی لەبارەی هەڵکەوت و جۆری کارکردنی یاساکانیانەوە (فۆنۆلۆجی ، رستەیی یان واتایی بێت هەندێ تایبەتی تری زمانی مرۆڤ خستووتە روو . زمانی مرۆڤ بەگشتی لەسەر چەند بنەمایەك کاردەکات : ـ

أ . بنەمای ئەرك سووککردن : بەپێی ئەم بنەمایە زمانی ئادەمیزاد بەگشتی هەوڵ دەدات لە ئەرکی قسە پێکەرانی کەمبکاتەوە ، هەر لەبەر ئەمەشە کە ئەو فۆرمانەی زۆر بەکاردێن (1) کەمن لەژمارەدا (2) کورتن و (ژمارەی برگەیا کەمە) (٣) فرەواتان . یەکەم کەس کە بەم بنەمایەی دەست نیشان کرد لە زمانی مرۆڤدا ك . زیپف بوو . وشەکانی زمانی مرۆڤ بەباوەڕی زیپف وەکو ئەو ئامێرانەن کە مرۆڤ بەکاریان دێنێت ، ئەو ئامێرانەی کە زۆر بەکار دێن دەبێت سووك بن ، لەبەر ئە ستا بنو بەکەڵکی زۆر ئیش بێن . بۆ سەلماندنی ئەم بنەمایەی زمان ، زیپف بە درێژی بەراوردی ئەرکی چەند وشەیەکی بڵاوی چەند زمانێك دەکات و بەدوایدا دەگاتە ئەم ئەنجامە (بروانە ـ زیپف ـ 1949) .

ب . بنەمای هەڵبژاردن : لەهەمووئاستێکی زماندا ، هەر زمانێك بگرین دەبینین لەناو ئەو یاسایانەی کە لەزمانی مرۆڤدا بڵاون و بەکار دێن ، تەنیا چەند یاسایەکی دیاریکراوی بۆخۆی هەڵبژاردووەو هەندێك لەم دیاردانەش لەرووی ژمارەوە زیاترن لە زمانی مرۆڤدا لەدیاردەی تر . بەم پێیە لەئاستی فۆنۆلۆجیدا دەبینین کە جیاوازی دەنگداری و کپی زۆر بڵاوترە لەزماندا لە جیاوازی لێوخڕ ـ کردن و لێو پانکردنەوە . هەروەها لەئاستی رستەسازیشدا دەبینین هەر زمانە کۆمەڵە یاسایەك هەڵدەبژێرێت . بۆ نمونەش لەزۆربەی زمانەکانی گێتی‌دا فریزی ناوی بریتیە لە ناو لەگەڵ ئاوەڵناودا (ناو + ئاوەڵناو) نەك (ئاوەڵناو + ناو) .

دەبێت لێرەدا پەنجە بۆ راستیەکی تر رابکێشین لەم هەڵبژاردنەدا ، ئەویش ئەوەیە کە هەندێ یاسا لەپێشترە لە یاسای تر . بۆ نمونە ئەو زمانانەی کە بزوێنەکانیان بەپێی بەرزی و نزمی دابەش دەکەن لەوانەشە بەپێی خڕی و ناخڕی لێویش دابەشی بکەن ، بەڵام بە پێچەوانەوە نابێت . بەواتایەکی تر زمانیە بزوێنەکانی هەر بەپێی خڕی و ناخڕی دابەش بکات ، بەڵام زمان زۆرە کە هەر بەپێی بەرزی و نزمی پۆلیان دەکات (کوردی) . لە ئاستی واتاشدا لە پێشتری هەندێ یاسا ئاشکرایە . بۆ نمونە تەنیا لە دوای جیاکردنەوەی رەنگە بنەرەتیەکان ، زمان فۆرم دادەنێت بۆ رەنگە نابنەرەتیەکان . بەم پێیە «سوور» پێشترە لە «پەمەیی» ، جگەری .....» .

ج . بنەمای جەمسەر گرتن (الاستقطاب) : یەکێك لەو تایبەتیە ناوکۆیانەی کە لە زمانی مرۆڤدا هەیە ئەوەیە کە هەموویان لەو دوو جەمسەرەی کە لە ئارادا هەیە (جەمسەری ئیجابی و سلبی یان نەفی و مثبت) زیاتر جەمسەری یەکەم پەسەند

دەکەن . ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێت کە (1) جەمسەری دووەم نەك یەکەم لە هەموو زمانێکدا نیشانەی بۆ دانراوە (خۆش / ناخۆش ، ئەبوم / ناپوم ، دەوڵەمەندە / دەوڵەمەندنیە ..... هتد) . (2) جەمسەری یەکەم لەپێشترە لە فێربوون و ڕیز کردندا . زۆر لێکۆڵینەوە دەری خستووە کە منداڵ لەپێشەوە فێری وشە ئیجابیەکان دەبێت ئینجا وشە دژواتاکانیان ، دیسانەوە لە وتنیشدا دەبینن کە وشە ئیجابیەکان پێش دەکەون بەتایبەتی کە داوای وشەی دژ واتا لە خەڵك دەکەین .

6 — بە لێکۆڵینەوەکانی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو جیاوازییانەی لەنێوان زمانی مرۆڤ و زمانی زیندەوەری تراد هەیە ، جیاوازیە لەپلەدا و هەرگیز ناگاتە ئەو ڕادەیەی هەردوو جۆرە زمانەکە تەواو لەیەك بکات یان لەیەك بترازێنێ و وامان لێ بکات دوای بۆچوونە هەڵەکەی زمانەوانە سلوکیە ئەمریکانییەکان بکەوین و گوێ نەدەینە ئەو هەموو تایبەتیە ناو کۆییانەو هەردوو جۆرە زمانەکە بە دوو دیاردەی تەواو جیا لەیەکتر دانێن .

بۆ ئەوەی چاکتر لەو پەیوەندییە بگەین کە لە نێوان زمانی مرۆڤ و قیژەو بانگی زیندەوەری تردا هەیە پێویستمان بەوە هەیە کە زمان بەگشتی وەك پەیژەیەکی چەندەها پلەیی سەیر بکەین ، بەرزترین پلەی پەیژەکە دابنێین بۆ زمانی مرۆڤ لەبەر ئەوەی باشترین و چالاکترین جۆری زمانە ، پلەی دوای ئەم دابنێین بۆ زمانی دۆلفین چونکە تەواو نزیك دەبێتەوە لە زمانی مرۆڤ و تایبەتی ناوکۆیمان هێندە زۆرە کە بەهۆی ئامێری فۆکۆدەرەوە ، کە تەرەدودی شەبەنگەی قسەی دۆلفین دەگۆڕیت بۆ تەرەدودی قسەی مرۆڤ ، مرۆڤ دەتوانێت لەسەر زەویەوە قسە لەگەڵ دۆلفینێکدا بکات کە لەژێر ئاودابێت . هەر یەکەیان تەرەدودی خۆیان بەکار دێنن ، ئامێرەکە تەرەدودی هەریەکەیان دەگۆڕێتە سەر ئەوی تریان ، بەم جۆرە بەسەر کۆسپی هەواو ئاودا زاڵ دەبێت و مرۆڤ و دۆلفین دەتوانن لەیەکتری بگەن (خۆن لیلی 1980) . بەدوای زمانی دۆلفیندا ، نزیکترین بانگ و قیژە بۆ زمانی مرۆڤ سەمای هەنگە چونکە چەند تایبەتیەکی گرنگی تێدا دەبینرێت وەکو بەکار هێنانی ڕەمزی لە خۆوەوە ، بوونی دەنگ و یاسایەکی ڕێزمانی ، توانای لەپەکدان و دروست کردنی ڕەمزی نوێ ، ڕۆڵ گۆڕینەوەو توانای گوێزانەوەی کات و شوێنی قسەیان ، دووان لەرابوردوو نەهاتوو . بەم جۆرە دەتوانین پلەکانی تری پەیژەکەش تەرخان بکەین بۆ زمانی زیندەوەرەکانی تر بەپێی نزیکی و دووریان لە زمانی مرۆڤەوە تا وەکو وێنەیەکی ڕاستی پەیوەندی نێوان زمانی مرۆڤ و زمانی زیندەوەری ترمان دەست کەوێت .

## پەراوێزەکان : -

---

(1) بۆ نموونە فەرهەنگەکەی (Dupont do Nemours) ساڵی 1807 کە تیادا سەدەها وشەی فەرەنسی بەرامبەر وشەی «زمانی هوزار» و «زمانی قەلە باچکە» دانراوە . هەروەها (schwidetsky) یاریدەرێکی بەڕێوەبەری باخچەی گیان لەبەرانی واشنتۆن لەم دوایەدا فەرهەنگێکی ئنگلیزی - مەیمون و مەیمون - ئنگیزی دەرکردوە .

(2) بڕوانە باسەکەی (کلیر رەسل) و (و .م . رەسل) کە تێدا ژمارەی ئەو فۆنیمانە ئەدەن کە «لە زمانی» زیندەوەری تردا بۆمان ساغ کراوەتەوە . بۆ نموونە : دۆلفینی ئامەزۆن (7) ، جۆرێك جووت (7) ، مریشکی ماڵی (20) - گۆریلا (20) شامپانزی (23) - مەیمونی یابانی (37) .

## سەرچاوەکان : -


1 .Noel Minnis : 1971 . Liny uistics at Lavye , pp . 16I — 190 .

2 . Bouchev , T. , Osyood : 1969 the Pollyana hypothesis .

3 . Pvemack , D : 19 . Lanyuaye in chimpanzea , science 172 pp . 808 — 822 .

4 . Bvown , Royov , W : 1973 A Fivst Lanyuaye

5 . Osyood , Chavles , E . 1996 : Lectwev on Lanyuaye Pevtovmance , PP . 1 — 17



# ٣- من «گەدە»ی مامە عەبەم

**نووسینی : ج. د. راتکلیف**

**وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە : ماهر وسمان قادر**

**ئەرێ مامە عەبەتان لەبیر ماوە؟ مانگێك لەمەو بەر، یەكێك لە هاوسێكانم باسی بۆ كردن ئەویش (دڵ)ی مامە عەبە بوو . (دڵ)ی مامە عەبە باسی خۆی بۆ كردن‌و فەرموون ئێستاش لەگەڵ چیرۆكی من .**

مامە عەبە زۆر دڵی بەمنەوەیەو وادەزانێ من گرنگترین ئەندامی لەشی ئەوم . لەراستی‌دا بە هۆی منەوەیە مامە عەبە رۆژێ سێ ژەم دەخوا. خۆ ئەگەر من نەبوامایە رۆژی بەشەش ژەمیش تێری نەدەخوارد . دوانزە گرێ خواردەمەنی هەرس دەكاو منیش خەریكی هاڕینی پرۆتینم .

لە دەرەوە رەنگم پەمەیی‌یەو لە ژوورەوەش وەك پارچە قوماشێكی حەریری دەق كراوم . كە بەتاڵ دەبم هەر لە میزڵدانێكی فوونەكراو دەكەم . كە مامە عەبە تێر دەخوا پڕی خۆراك دەبم‌و دەئاوسێم . لای سەرەوەم زل دەبێ‌و لای خوارەوەم بچووك . توانای حەواندنەوەی نزیكەی نیو گالۆن خۆراكم هەیە .

هەر چەندە كەوا هێندە گرنگ نیم كە مامە عەبە بیردەكاتەوە بەڵام ژمارەیەك لەو كارانە جێبەجێ دەكەم كە ژیانی مامە عەبە خۆش دەكەن . دیوارەكانی ژوورەوەم ٣٥ ملیۆن گلاندی تیایە كە رۆژی نیو گالۆن ترشی هایدرۆكلوریك‌و جۆرەكانی‌تر دەر دەكەن‌و ترشی پیپسین دەخەنە كارو ئەویش دەبێتە هۆی هەرس‌كردنی پرۆتین . بێ پیپسین هەر جار مامە عەبە گۆشتی سووركراوە بخوات حاڵی شڕ دەبێ .

زۆر كەس وا تێ دەگا من وەك بەرمیلێكی بە هێزم‌و هەرچی مامە عەبە قووتی دەدا كارم تێ ناكا . نەخێر وانیە . كە مامە عەبە نانی نیوەڕۆ دەخوا . خواردەمەنی جۆراوجۆر دێنە ناوم‌و دەست بەكاركردن دەكەم‌و ماسوولكەكانم دەست بە جووڵانەوە دەكەن . ئەو خواردەمەنی‌یانە لەگەڵ ئەنزیمەكانم تێكەڵ دەكەن‌و دەیشێلن تاكو وەك هەویری لێ‌دێ . ئینجا باڵی پێوە دەنێن بەرەو دوانزەگرێ . خۆ ئەگەر چالاك‌و ئاگادار نەبم ئەوا بەشێكی زۆر لەو هەویرە دەچێتە ناو دوانزەگرێ‌و تووشی هەوكردنی دەكا .

چەند دەقیقەیەكم بەسە بۆ شێلان‌و هاڕینی پەتاتە. گۆشت تۆزێك زیاتر ماوەی دەوێ‌و سەوزەوات وەها زیاتر . خۆراكی چەور تووشی گیروگرفتم دەكا . ئەگەر مامە عەبە بەیانی زوو گۆشت‌و هێلكەو كەرە بخوا ئەوا كاتی خواردنی نیوەڕۆ دێت‌و من هێشتا خەریكی هەرس كردنی خۆراكی بەیانیم. ساردەمەنیش كارم تێ دەكا : ئەگەر مامە عەبە قاپێك چلووردو شتی سارد بخوا ئەوا ( ٢٠ ) پلەی فەهرەنیهایت دێمە خوارێ لە پلەی ئاسایی خۆم كە (٩٩) پلەیە .

**لە ڕاستی‌دا ژیانی من جیاوازە لەگەڵ ژیانی هاوسێكانم . دڵ‌و سی‌یەكان‌و جگەرو گورچیلەكان رۆژی ( ٢٤ ) سەعات لەكاركردن دان بەڵام من كاری خۆم تەواو دەكەم‌و پشوو دەدەم . مامە عەبەش بەختێكی چاكی هەیە كە لەشی خۆم هەرس ناكەم لەو كاتەی توانای هەرس كردنی هەموو جۆرە گۆشتێكم هەیە ، هۆی ئەمەش ئەوەیە كە لە ژوورەوە بە پەردەیەكی زۆر سەخت‌و بە هێز داپۆشراوم .**

خۆ ئەگەر بێینە سەر راستی رەوشتێكی تریشم هەیە جگە لە هەرس كردنی خۆراك . من وەك ئاوێنەیەك وام . كاتێ مامە عەبە تووڕە دەبێ‌و ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕێ ئەوە منیش سوور دەبمەوە . كە ئەو دەترسێ‌و رەنگی زەرد دەبێ منیش وەك ئەوم لێ دێ كە مامە عەبە خواردەمەنی‌یەكی بە تام دەبینێ من لە شوێن خۆم دەكەومە كارو ئەنزیمەكانم هەڵدەڕێژم . مامە عەبە لەو كاتەدا وا دەزانێ لە برسانا سكی ژان دەكا . كە مامە عەبە بەخەم دەبێ ئەنزیمەكانم ڕادەوەستن . مامە عەبە نانی خۆی دەخوا بەڵام خۆراكەكە لەناو مندا دەمێنێتەوە بێ هەرس كردن . لەكاتی وادا وا چاكە كەم بخوا نەوەك ترشەكانم تووشی هەوكردنی بكەن .

لە هەوكردن‌و شێرپەنجە بەولاوە كەم نەخۆشی تر كارم تێ دەكەن . بۆ نموونە ئەگەر هێسكە ماسی‌یەك برینداركات لەماوەی ( ٢٤ ) سەعاتدا برینەكەم چارەسەر دەكەم . ئەگەر پارچە گۆشتێكی ماك‌دار بخەنە ناو ئاوێكی پالێوراو . ماكەكان دەكەونە كارو چالاكیان زیاد دەبێ . ئەگەر بیخەنە ناو ئەنزیمەكانی من زۆربەی ماكەكان دەمرن . هەندێ شت كارم تێ دەكەن‌و بێزارم دەكەن وەك بیبەرو قاوەو نیكۆتین‌و مەی . بۆیە ئەو كەسانەی هەویان هەیە پێویستە دووركەونەوە لەم شتانە.

دەرمان ؟ .. مامە عەبە زۆر حەز لە دەرمان دەكا ئەگەر پێویستیم هەبێ یان نا . دەرمانەكان ئازارم دەدەن .

مامە عەبە تاوانی زۆر شت بەمنەوە دەنووسێنێ . كە سكی قۆڕەقۆڕ دەكا وا دەزانێ منم . من هیچ گوناهم نیەو گوناە هی دوانزە گرێیە . كە مامە عەبە زۆر دەخواو دەخواتەوە من دێمە هانای . وای لێ‌دەكەم بڕشێتەوەو شتی زیاد فڕێداتە دەرێ .

**لە كۆتایی‌دا حەز دەكەم بەمامە عەبە ڕاگەیێنم ئەگەر هاتو ئازاردانێكی لەمنەوە دیت بۆ ماوەی سەعاتێك‌و زیاتر ، زوو هانا بباتە بەر پزیشكەكەی .**

# ئافرەتی کورد و هەندێ وردە سەرنج ...!

رمزیە صابر محمد

**گومان لەوەدانیە کە کۆمەلی کوردەواری بۆ ماوەیەکی دورو درێژ بارێکی دواکەوتوویی ئابووریو کۆمەلایەتیو ڕوشنبیری نالەباری بەخۆیەوە دیوەو دەمێکی زۆریش بەدەست هەندێ خوونەرێتی کۆنەپەرستانە نالانوویەتی ، ئەمانە تێکرا بوونەتە هۆی ئەوەی تا سەردەمێکی زوو بەلکو تا ئیمرۆش هەندێ خێزان یاخوو فراوانتر بلێین هەندێ لەو ناوچەو شوێنانەی کە هێشتا دەستی ئاوەدانیو شارستانیەتو پێشکەوتنی کۆمەلایەتی نەگەییوەتێ بەدەست ئازارو ئەشکەنجەی ئەم بارە دواکەوتوویە بنالێنن ، هەرئەمەیش وای کردووە کەچینو تاقمە جیاجیاکانی نێو کۆمەل بەرەو ڕووی هەندێ پاشماوەی بیرو باوەڕی هەلەو دواکەوتووی نابەجێبنەوە بەشکلێ ڕێگەی پێشکەوتنو گەشەکردنی باری کۆمەلایەتیان لێ تەسك بکاتەوە بەلکو لەوەش زیاتر ڕەوڕەوەی کاروانی شارستانیەتیان ڕاگیر بکات.**

بۆ سەلماندنی ئەم ڕایەیشم بەباشی دەزانم کە هەندێ وردە سرنج لەبارەی باری ژیانی پڕ ئەشکەنجەو ئازاری ئافرەتی کورد بخەمە ڕوو بەو هیوایەی کە لەدەرفەتێکی تردا زیاتر شۆڕ ببمەوە بۆ ناخی کێشەکەو بەووردی لایەنە جیاجیاکانی تری باری کۆمەلایەتی ئافرەتی کورد وددەر بخەم بەمەبەستی ئەوەی بتوانم بەشداریەکی چالاکانە بکەم لە پێناوی چارەسەرکردنی هەندێ لەو کێشانەی کەئیمڕۆ بوونەتە تەگەرە لەبەردەم کاروانی پڕ خەباتی ئافرەتی کوردو . ئەو تەگەرانەی بەمیرات ماونەتەوە بۆ کچانی کوردی ئیمڕۆمان کە ئەرکێکی گەورەیان لە ئەستۆدایەو دەبێ بەوپەڕی ئازایەتیو لەخۆبوردنەوە درێژە بەخەباتو تێکۆشانیان بدەن بۆ ئەوەی بەکورتترین ماوە زەبرو زەنگی ئەونەریتو ڕەوشتە کۆمەلایەتیە لەبار کەوتووانەی تا ئێستا ئافرەتی کورد لەبەریان بەئازارە بەرەو نەمانیان بەرێو کۆمەلگایەکی بەختەوەرو پێشکەوتوو دورست بکەن تاوەکو لەژێر سایەیدا ئافرەت هەست بەو حەسانەوەیە بکات کەبۆی هەوڵ دەداتو تێدەکۆشێ .



■ جیاوازی کردن لەنێوان کوڕو کچدا

( وەکو بۆ هەمووان ئاشکرایە کچ هەر لەیەکەم ڕۆژی لەدایكبوونیەوە ئەو بایەخەی پێ نادرێ وەك چۆن بەکوڕ دەدرێ ، هەر کچە شەوارەی بۆ ناگرنو گوێزەبانەی بۆ ناکەنو ئاهەنگی ناونانی نیەو تەنانەت سەبەتەو بێشکەیشی وەکو کوڕ بۆ ناڕازێندرێتەوە . ئەمە جگە لەوەی کە زۆر جاری وابووە ئافرەت لەکاتی مندالبوونیدا ئەگەر چی بەئازارو ماندووشەکەتیش بووە بەلام کەکچی بووە ئەوە ئیتر هەر لەکاتی ناووكبڕیندا مەلۆتکەکەیان لەبەردەم هەلگرتووەو شاردوویانەتەوە بۆ ئەوەی نەزانێ کچی بووە . نەوەك خەفەتی پێبخواو لەهۆش خۆی بچێو کاری تێ بکاو ئازاری پێبگاتو بیئالۆزێنێ . بەلکو وەك دلدانەوەیەك پێیانگوتووە « شوکر خوا کوڕی پێبەخشیوی »(١) . ئەمە وەنەبێ بڕابێتەوە بەلکو تائیمرۆش لەزۆر ناوچەو شوێندا پاشماوەی بەمیرات ماوەتەوە بەتایبەتی لەو لادێیانەی کەهێشتا دەستی شارستانیەتو



پێش‌کەوتنی کۆمەڵایەتی نەگەیوەتێ ئەم جیاوازیە وەنەبێ هەر لەدەوری منداڵیدا ڕوو بدات بەڵکو گەلێ جار لەگەڵ منداڵەکەدا گەورە دەبێت‌و تا ئەو ڕۆژەی خواحافیزی لەماڵی باوکیشی دەکات هەر لەگەڵیدا دەژی‌و لێی جیانابێتەوە ..

جا بۆ ئەوەی دایکان‌و باوکان دەوری سەرەکی خۆیان بینن لە پەروەردەکردنی ڕاست‌و دورستی منداڵەکانیاندا بۆ ئەوەی هەر تەنها دایك‌و باوك نەبن‌و بەس. بەڵکو هاوڕێ‌و مامۆستاو ڕێپیشاندەری دڵسۆزو ڕابەری ڕاستەقینەیی کچەکانیان بن بەتایبەتی لە تەمەنی هەرزەکاریدا که کچ بیری بۆ زۆر شت دەچێت‌و ڕووداوەکانی دەورو بەری بەئاسانی کاری لێ‌دەکەن‌و دەیبزوێنن . جا گەر دایکان‌و باوکان زیرەکانە ڕەفتار لەگەڵ کچەکانیاندا نەکەن ئەوە وەك دەڵێی خۆیان کێشەو گرفت بۆخویان دورست دەکەن؛ نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە ئەو جیاوازیەی لەسەرەوە پەنجەمان بۆی ڕاکێشا گەر هەروامایەوەو چارەسەری نەکراو زیادبوو ئەوە کچان‌بەتایبەتی‌و خێزانەکە بەگشتی ڕوو بەڕووی ڕق لەیەکتری بوونەوەو دووربەرەکی‌و بەڕەڵلایی دەبێتەوە کەئەمەیش کارێکی سەلبی‌و خراپ دەکاتە سەر دوارۆژی منداڵەکانیان جا چ کوڕ بن چ کچ. وەئەم ڕق‌و کینەو ئازارە لەگەڵیاندا گەورە دەبێت‌و پەل‌دەهاوێت بۆ خێزانی تریش ئەمەیش خۆی لەخۆیدا دەردێکی کوشندەیەو بەرەو ڕووی کۆمەڵ دەبێتەوەو شوێنەواریشی بەئاسانی ڕەش نابێتەوە .

## ■ کچ‌وقۆناخی هەرزەکاری

هەربۆیە کە کچان دەگەنە قۆناخی هەرزەکاری دەبێ باوکان‌و دایکان بزانن چۆن ڕەفتار لەگەڵ کچەکانیاندا دەکەن. دەبێ خۆیان بەیەکەم لێپرسراو دابنێن‌و نەك هەرکارە

پەروەردەیە ساکارەکە بەبەر چاو خۆیانەوە بگرن‌و بەس. بەڵکو دەبێ خۆیان لەشوێنی دڵسۆزترین‌و ـ نزیکترین کەمیان دابنێن‌و زۆر زیرەکانە لەگەڵیاندا بکەونە گفت‌وگۆو پرسیاروەڵام بۆ ئەوەی بتوانن لەنزیکەوە چارەسەری زۆربەی هەرەزۆری ئەو کێشەو بیروڕا تایبەتیانەیان بکەن کە لە قۆناخی هەرزەکاریا ڕوو بەڕوویان دەبێتەوە. لەم بوارەشدا هاوکاری تەواوو دڵسۆزانەی ئەندامانی خێزان دەبێتە باشترین‌و سەرکەوتووترین

ڕێباز بۆ پەیرەو کردنێکی نموونەیی لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بەگشتی‌و کچانیان بەتایبەتی کەزیاتر پێویستیان بەو یارمەتیە هەیەو هەردەم چاویان بڕیوەتە ڕێنمایی کردنێکی دڵسۆزانەی باوکان‌و دایکان .. ئینجا کە لەم قۆناخە دەردەچێت‌و دەکەوێتە ماڵێکی سەربەست‌و خۆی بەرپرسیاری زۆر هەڵس‌و کەوت‌و رەفتارو جولانەوەی خۆی دەبێت واتە کەشوو دەکات، ئیتر ئەوسا لەبارێکی‌تر خۆی دەنوێنێ کەئەویش کارکردن‌و چەوسانەوەیە شان بەشانی پیاو بەڵکو لەزۆر مەیداندا لەوانەیە ئەرکەکەی ئەوزۆر گەورەترو بەئازارتر



بێت ئەمە سەرەڕای . ئەوەی لەگەڵ هەموو ئێش و ئازارو چەوسانەوەیێکی کۆمەڵایەتی‌دا تێکەڵ‌دەبێت وەنیسبەتێکی یەجگار کەمیش هەن کەماوەی ئەوەیان هەبێت بەتەواوی ڕای‌خۆیان بەسەربەستی دەربڕن‌و بتوانن تەعبیر لە ئاوات‌و خواستە ڕەواکانی خۆیان بکەن لەهەموویشیان لەپێشتر دیاری‌کردنی سەرەنجامی ژیان‌و دوارۆژو هەڵبژاردنی ئەو هاوسەرەی کە دەیانەوێ بەدرێژایی تەمەن ژیانی لەگەڵدا بەسەر بەرن ...

وەپاشماوەی ئەم دیاردە پڕئێش‌و ئازارە تا ئێستایش لەلادێ‌کاندا باوەو بەڵکو دەورێکی گاریگەریشی هەیە لە ڕوودانی جۆرەها کارەساتی گەورەو ترسناك بەجۆرێ کە هەندێ جار زیاتر لەخێزانێك تووشی دەربەدەری‌و تێکدان دەکات .. ئەم ڕەفتارانەیش بوونەتە کۆسپ‌و تەگەرەی گەورە لەبەردەم بەرەوپێش چوونی باری کۆمەلایەتی‌و گەشەکردنی‌دا .. کەئەمەیش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتنی بارە ئابووریەکەو مانەوەی هەندێ پاشماوەی بیری دەرەبەگایەتی لەو شوێنانەدا کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەسەڵاتیان بەسەردا دەشکاو بەئارەزووی خۆیان تێیدا دەهاتن‌و دەچون .. هەر بۆیەشە دەبینین تا ئێستا ئافرەتی کورد یا بەندی ماڵەباوانیەتی‌و بەدگمەن هەڵدەکەوێ خێزانێك لەم بیرە تەسکەدا ڕزگاری بوو‌بێت .. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا گەر بەراوردێکی باری ژیانی ئافرەتی لادێ بکەین دەبینین لەزۆر ڕووەوە لەئافرەتی نیو شار باشترەو تا ڕادەیەکی چاك جۆرە سەربەستیەك لەبەردەم خۆیدا دەبینێ‌و لەزۆر بواریشدا دەوری کاریگەرانەی خۆی هەیە. بۆنموونە ئافرەتی لادێ‌نشین ئەگەر چی توانای دیاری کردنی سەرەنجامی ژیان‌و دوارۆژی خۆی لەدەست خۆی نیەو ناتوانێ چۆنی مەبەستە ئاوا بڕیاری لەسەر بدات‌و بەئاشکرا هاوسەری ژیانی خۆی هەڵبژێرێ‌و چارەنووسی خۆی دەستنیشان بکات. بەلام لەئێش‌و کارو دەشت‌و دەرکردن‌و بەرگ‌پۆشین‌دا ئەگەر چی لەنێو سنوورێکی تەسکی خێلەکی‌داو لەناوچەیەکی تا ڕادەیەك دوور لەشارستانیەت‌و پێش‌کەوتنی ڕۆشنبیری‌و کۆمەلایەتی‌دا دەژی بەلام دیسان توانیویەتی پارێزگاری لەبەشێکی چاکی سەربەستی خۆی بکات لەزۆر مەیداندا. ئەو هەقەی خۆی بەکار ئەهێنێ‌و لە ڕێگەیشیەوە بوونی دەسەلمێنێ ..

سەرەڕای ئەمانەش هەموو وەنەبێ ئافرەتی کورد هەر لەنێو قاوغەتەسکەکەدا مابێتەوەو نەجوولابێت بەلکو زۆر هەنگاوی خێرای‌ناوەو لەزۆر مەیدانیشدا بەشداری چالاکانەی کردووەو گەلێ جاریش گەر شان بەشانی براکانی نەڕۆشتبێ ئەوە لەوان دانەبڕاوە. بۆ ئەمەیش بەلگەی چاکمان هەیە کەچۆن ئافرەتی کورد لەمەیدانەکانی سیاسی‌و ئابووری‌و ڕۆشنبیری‌و پەروەردەیی‌و خزمەتگوزاریدا دەوری خۆی دیوەو بەردەوامیش بەرەوپێشەوە هەنگاوی ناوە لەپێناوی کۆتایی هێنان بەپاشماوەی ئەو بیروباوەڕە کۆنەپەرستانە ـ یەی‌کەئافرەت بە ئەندامێکی بێ نرخ دا دەنێت‌و بایەخ بەو دەورە گارێگەرەی نادات کەهەیەتی .. بەڵکو هەر لەڕووانگەی « ئافرەت هەر ئافرەتە » حیسابی بۆ دەکات کە ئەمەیش خۆی لەخۆی‌دا دیاردەیەکی دواکەوتوانەی پووچەڵەو باوی بەسەر چووەو خاوەنی ئەم بیروڕا نەزۆکانەیش ئەو ئەندامە بێ دەسەلاتانەی کۆمەڵن کە دەستەو ئەژنۆ لێی کەوتوون‌و چاوەنواڕی نەمان‌و لەنێو چوونی دەکەن‌و کۆمەڵی کوردەواریش لەم جۆرە بابەتانە ڕزگاری دەبێت‌و ڕەوڕەوەی پێش‌کەوتنی ئافرەتی کوردیش بەنەمانیان خێراتر بەرەو پێش دەکەوێتە ڕێ بۆ ئەوەی بگاتە کاروانی پێشکەوتنی گەلانی ئازادو سەربەستی جیهان ..

■ **سەرچاوە :**


**بنچینە کۆمەلایەتیەکانی ئافرەتی لادێ‌نشینی کوردەواری .**

# شیری دایك

ئامادە كردنی
كەوسەر قادر طە

شیری دایك لە سەرووی هەموو ئەو شیرانەیە وەك خواردن كە دەدرێتە منداڵی تازە بوو .. چونكە شیری دایك خواردنی زۆر سووكەو پاكە لە هەموو جۆرە میكرۆبو بەكتریایێكی بێ سوودو گەرمایشی دەگونجێ بۆ گەدەی منداڵ .

**وە ئەو منداڵانەی كە بە شیری دایكیان گەورە دەبن دوورن لە نەخۆشی ئەستوور بوونی ریخەڵۆكو سنگو گــەروو وە ئەوەش لە منداڵانی دەوڵەتە دواكەوتوو تازە پێگەیشتووەكانەوە بەدی دەكرێ چونكە شیری دایك ڤیتامینی Aو Dی زۆر تێدایە كە لەشی منداڵ پێویستی پێ هەیە تا تەمەنی دەگاتە (٦) مانگ وە ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە منداڵەكە تووشی خوێن كەمی نەبێ وە نیسبەتی تەسك بوونی دەمارەكانی خوێنو قـەڵەوی كەمتر تووشیان بێ لەو منداڵانەی كە بە شیری دایكی خۆیـان گەورە ناكرێن ..**

شیری دایك كاریگكی گەورەی بۆ هەستو دەروونی منداڵ هەیەو دەبێتە هۆی بەهێز كردنی خۆشەویستیی دایـكو منداڵەكەیو زیاتر دایكەكە پەرۆشی دەبێ بۆ پەروەردەكردنو بەخێوكردنی ..



لەم دواییەدا ئیسپات بوو ئەو منداڵانەی بە شـــیری دایكیان گەورە دەكرێن لە بارەی تەندروســـتیو لـــەشو دەروونییەوە زۆر ساغترن لەو منداڵانەی كە بە شیری دایكی خۆیان گەورە ناكرێن .. وە هەروەها بۆ زاناكان روون بۆتەوە ئەو ئافرەتەی منداڵەكەی بە شیری خۆی بەخێو دەكا مـاوەی بەینی دوو سكی زیاترە لەو ئافرەتەی منداڵەكەی بەشیری خۆی بەخێو ناكا . هەمیشە ئەو جیاوازیەش كار دەكاتە ســـەر تەندروستی دایكو پەروەردە كردنی منداڵەكەی ..

پاش ئەو كورتە باسە دەبێ رەچاوی هەندێك حالـــەت بكرێتو بە وریایی شیری بدرێتێ ئەگەر منداڵەكـە نەخۆشو ماندوو دیار بوو وەیاخود لێوەكانی كەمو كورتی تێدا بوو وەك شەق بوونو قەڵەشتی ..

بەڵام لە حاڵەتی نەخۆش بوونی مەمكو ئەستوور بوونی گورچیلەو وەرەمو ناخۆشی دەروونی دایك نابێ شیری بدانــە منداڵەی . وە ئەگەر لەسەر منداڵە تازەبووەكەی ســـكی پەیدا كرد دەبێ شیری لە منداڵەكەی كەم بكاتەوە تا سكی دەگاتە هەفتەی بیستەم ئەو وەختە نابێ شیری خۆی بداتێ ..

**ئەمەش چەند ئامۆژگاریەك بۆ ئەو دایكانەی بە شـــیری خۆیان منداڵەكانیان بەخێو دەكەن :**

- **پێویستە دایك بزانێ كە منداڵ گەورە كردن بە شیری خۆی سوودێكی چەند زۆری هەیە .. وە دەبێ ئـارەزوویێكی راستەقینەی هەبێ لە كاتی شیردان .. چونكـــە بچووكترین نەخۆشی دەروونی دایك لەسەر منداڵەكەی رەنگ دەداتەوەو ئەنجامەكەشی بێسوود دەبێ ..**

- پێویستە دایك خواردنی چاكو بە سوود بخواو خۆی زۆر برسیو ماندوو نەكات .. وە ئەگەر تووشی هـــــەر نەخۆشییەك بوو بە زوترین كات چارەسەری خۆی بكـــاتو نەیخاتە پشت گوێ ..

- **تا مانگی سێیەم منداڵ زۆر شیری پێویستەو باشـــتر ئەوەیە تا مانگی حەوتو هەشت بەردەوام بێتو ئینجـــــا وورده وورده لێی كەم بكاتەوە .**

- **پاش ئەوەی منداڵەكە تێر شیر بوو دەبێ دایكی مەمكی خۆی بكوشێ بۆ ئەوەی ئەو شیرەی تێیدا ماوە بێتە دەرەوە ..**

- **بەتاڵ بوونی شیری مەمك بەزۆری دەكەوێتە ئەستۆی منداڵ ..**



■ پێش منداڵ بوون بە چەند هەفتەیەك پێویستە دایکەکە ڕۆژی جارێك یان دوو جار مەمکی خۆی بکوشێ بۆ ئەوەی ئەو شیرەی هەیە لەناو مەمکەکە بێتە دەرەوە .. چونکە پاش منداڵ بوون مەمکی دایك ئەستوور دەبێ‌و ژان دەکا ئەمەش کار دەکاتە سەر شیردانی منداڵ ..

■ پێویستە ناوە ناوە ئاگاداری قورسایی منداڵەکەت بی تا بزانی چەند شیر دەخوا یان ناخوا .

■ لە ( ٥تا١٠ ) دەقە دەبێ منداڵەکە جێگۆڕی بکەیت لەو مەمك بۆ ئەو مەمك بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا نابێ لـە ( ٢٠ ) دەقە زیاتر بێت ..

**« دنیـــایێکی سـەیر »**



**زۆر جار یارمەتی دەبێتە هۆی ناخۆشی !!**

ئافرەتێکی ئەڵمانیای ڕۆژ هەڵات لە شاری کۆبناس داوای تەڵاقی لە مێردەکەی خۆی کردووە چونکە مێردەکەی زیـاد لە پێویسـت یارمەتی دەدا لە کاروباری ئەو ماڵدا تا ئەو ڕادەیەی ئافرەتەکە هەست بەوە دەکا کە هیچ بڕختێکی نەمـــاوە وەك کابانێك لەو ماڵەدا ..

ئافرەتەکە بە جەنابی قازیی ووت : مێردەکەم جل‌و بەرگ دەشواو شووشەی پەنجەرەکان دەسڕێتەوەو گەسکی ناوماڵ دەداو سێ جەم خواردن دروست دەکاو هەموو پێویستی‌یەکی ناو ماڵیش دەکڕێ .. بەکورتی شت نی‌یە نەزانێ‌و نەیکا .. ئەی باشە جەنابی قازی من لەو ماڵەدا بۆچی چاکم ؟؟

قازی‌یش ووتی :

**بۆ تەڵاق چاکی !!**

**زۆر جاریش یارمەتی نەدان دەبێتە هۆی ناخۆشی !**

ئافرەتێکی ئەمریکی لە شیکاگۆ داوای تەڵاق لە مێردەکەی خۆی دەکا چونکە مێردەکەی زۆر زۆر تەمبەڵەو چاو لە هەموو پێویستی‌یەکی ناو ماڵ دەپۆشێ‌و خۆی لێ گێل دەکا !.

بەڵام جەنابی قازیی توانی ئافرەتەکە ڕازی بکا بەوەی واز لە تەڵاق بێنێ دوای سزایەکی زۆر سەیر کە بەسـەر مێردەکەیدا درا .. سزایەکەش ئەوەیە ئەبێ مێردەکە هـەموو بەیانی‌یەك هەڵسێت‌و هەرچی کاروباری ناوماڵ هـەیە جێ بەجێ‌ی بکا بۆ ماوەی ( ١٢ ) مانگ‌و لە ژێـر چاودێریی پۆلیسێکی ناو چەکەی خۆیاندا !!

**« کـە پیر دەبی .. »**

لەم دواییەدا لە بەریتانیا ڕاپۆرتێك بڵاوکرایەوە تێیـدا ڕوونی کردۆتەوەو دەڵێ : ئافرەت بە گشتی چەند بەرەو تەمەن بڕوات قورسایی زێدە دەبێ‌و تووشی قەڵەوی دەبێ .. بەڵام پیاو بە پێچەوانەی ئافرەتەوە زۆر لە قورسایی لەشی کـەم دەبێتەوەو تووشی لاوازی دەبێ !!

**« بۆ ئاســانی »**

یەك لەو شتانەی کە دەبێ هەردەم ڕەچـاو بکـرێ هەڵبژادنی جل‌و بەرگی‌ی منداڵە بۆ لەبەر کردن‌و داکەناندنیان بە ئاسانی .. دەبێ لای سەری گەورەتر بێت لە هی خوارەوەی بۆ ئەوەی سەری منداڵەکە بە ئاسانی پێوەی بچێت ، چونکـە منداڵ حەز لە هەڵگێڕو وەرگێڕ ناکات لە کاتی جل لەبـەر کردنی‌داو دووریش نی‌یە لەشە نەرم‌و نۆڵەکەی ئازارێکی زۆر بخوات بێ ئەوەی تۆ هەستی پێ بکەیت !!

# لە گەڵ دیداری دووەمی چیرۆكی كوردیدا

### بەشی پێنجەم

## ناوەڕۆكی كۆمەڵایەتی لە چیرۆكی « خەم و خەون »دا

**فوئاد مەجید میسری**

### چیرۆكەكە

## « خەم و خەون »

**ڕەزا سەید گوڵ بەرزنجی**

دوێنێ مردبوو ، پێرێ تیكەی زل زلو چەور ناو گەدەی ڕازندبوەو و قرقێنەی تێری بەڕووی خەڵكرا دەتەقاندەوە .

ئێمڕۆش لە بەردەم خەمەكانی دانیشتووە.. یەك یەك دەیهۆنی‌یەوەو تەشەنەی بە ناسۆری ژیانی دەدا .

كۆڵی ئارام بابردبووی .. بووخچەی خەمەكانی والا كردبوو .. نەیدەزانی ئەو خەمانە چی‌بوووا كتوپڕ بوون بە میوانی .

چاوەڕوانی ڕۆژێكی .. دەكرد هەرچەندی كرد



تروسكەیەكی ڕووناكی بەدی نەدەكرد . كەسیش نی‌یە خەمەكانی یا گرێ كوێرەكانی دەروونی یەك یەك بۆ شل‌كاتەوە .. خەمە تیرەكانی بڕەوێنێتەوە هیچ نەبێ بە دركاندنیان كەمێ باری دەروونی سووك دەبێت .

هەر چەند هێنای‌و بردی چ سەرە داوێكی نەكەوتە دەست ، بۆیە لەبەر خۆیدا وتی :

**ـ دەی .. كۆم تا قووڵ بێ مەلەی خۆشترە .**

هەستی ڕاگرت .. تەواوی هۆشی هێنایەوە لای خۆی ، لە خۆی ورد بۆوە :

ـ « كەس بێ خەم نی‌یە .. دنیا كە وای لێ هاتووە ، بەس نازانم بۆ خەمی كۆن‌و نوێ تێك دەكەنەوە .. دەڵێی خەم موحازەرەم بۆ دەدات » .

قسەكانی لەدەم دا پسا .. چەند خیزێكی قووت دایەوە ، دیسان لەگەڵ خۆیدا كەوتە قسەكردن .

« تەختە ڕەشەی دەروونم موحازەرەی خەم خەریكە پڕی دەكاتەوە ، دووڕنی‌یە جارێكی تر بۆم بەراوورد بكرێتەوە » .

**- کێ بکرم بەیار شێوەی لەتۆ بێ .**

ئەمەی بەدەنگێکی بیستراوەوە وت .

خەم نشتەرێك بوو لە جەستەی دەچەقی .. خەونەکەی هاتەوە یاد .. خولیای ئەوەی کەوتە سەر لە مەلایەك بپرسێت و بۆی لێکبداتەوە . تا گەیشتە مزگەوتەکە ئەم رستەیەی چەند جار وتەوە :

**- زین لە گوێ درێژ دەکرێت و کورتانیش لە ئەسپی رەسەن .**

پێش ئەوەی دەمی بقلیشێنێتەوە بۆ قسەکردن مەندیلی سەری مەلا لەگەڵ ئەو چەفیەیەی کە لە ملی ئالاندبوو سەرنجی راکێشاو لەبەر خۆیدا وتی :

- « ئەمە مەلایەکی زۆر گەورەیە هەموو شتێ دەزانێ » .

- مامۆستا لەو خەونەمدا خەڵکێکی زۆر دەورەیان لە کابرایەکی نوورانی دابوو . سەرتاپای کابرا لە جلی سپی دابوو .. ریشێکی سپی بەقەوەرایێکی تەواو چەناگەی جێهێشتبوو .. خەڵکەکە هەستیان راگرتبوو منیش تەبای ئەوان .. گوێم لێ بوو کابرای نوودانی دەیوت : « زەمانێك دادێ پیاوی شارەزاو لێهاتوو پیاوێ لە ناو پیاوان بخوێنرێتەوە لێدەکەوێ .. پشتگوێ دەخرێ .. دیوەخانیان نامبنێ پیاوی نەشارەزاو پیسە پیاو رێزیان دەگیرێ .. پرس و رایان دەکەوتە دەست ، دەبنە سەر بازار . زینی چاك لەگوێ درێژ دەکرێ .. کورتانیش لە ئەسپی رەسەن .

خەڵکەکە سەیری یەکتریان کرد . ئەمەندەی وتو لێیدا رۆیشت .

**- مامۆستا تێم بگەیەنە ... ئیمرۆ دڵم زۆر توندە بەلکو ئیوە .- ... ...**



**- بۆ داماوی ..!؟**
**- دەێ لەناو ئەم کتێبانەدا بگەرێم .**

مەلا کەوتە گەڕان .. جار جارەش دزەچاوێکی بۆ کابرا دەکرد ، کابراش چاوێکی بەو کتێبانەدا خشاند کە لە ناو کتێبخانەکەو تاق و پەنجەراندا رێز کرابوون ، ئینجا لە دڵی خۆیدا وتی :

« بەم هەموو کتێبە پەڕە زەردو سپیانە مەبەستی خەونەکەم دەدەن بەدەستەوە » .

مەلا زۆر کتێبی ئەم پەڕو ئەوپەڕ کرد .. گەڵێ پەڕی زەرد باو گەڕا .. چەندەها پەڕی بەیەکەوە نووساوو با پێ نەکەوتوو لێك کرایەوە .. هەندێکیان لە بن پەنجەیدا زریکەی دڕانی لێ هەڵدەستا .

- « لێی ناگەرێن نیشەکە بکات هەر بابایە دێو خۆی دەگەیەنێتە بن هەنگڵ » .

**- نەم دییەوە .**
**- چیت نەدییەوە ؟!**
**- بلسی خەونەکەت .**
**- لەم هەموو کتێبە کەورانەدا ..! لەم پەڕ زەردو سپیانەدا بلسی خەونێکی بچکۆلانە ناکەن ..!؟ یانیچی ؟**
**- دەنا .. ئەمانە کتێبی زۆرچاکن هەموو جۆرە زانیارێکی تێدایە .**
**- ئێ کوا ..؟!**
**- بلسی هنیەکەی تۆ ناکات .**

- چش
- چشی چی .. هەریەکێک بۆرە خوێندەواری‌یەکی ببێ پێیان دەبێتە مەلا .. مەبەستم ...
- ئەمە بۆیە مەلا ئەوەندە ...؟!
- ئەوەندە چی .. تەواوی کە ؟
- هیچ .. باشە مامۆستا بەقەرینەیێ شتێ .
- نەء .. ئیشی قەرینەو مەرینە نی‌یە .

هەر دووکیان لە یەکتری مربوونەوە .. هەریەکەیان بەچاو شتی لەوی تر دەگەیاند .. جار ناجاریش ماسولکەی گەروو پەنا گوێیان لێ‌ی دەدا لەوە دەچوو قسەی تریان هەبێ ، لەبن زمان‌و گەروویاندا قووت دەدرایەوە ، هیچ نەوترا ، بێ‌دەنگی‌یەکی خەست رەشماڵێ بە سەریاندا هەڵدابوو .. لەمە زیاتری خۆ نەگیرا .. بۆی دەرچوو .

١٢ _ ٢٤ / ١٢ / ١٩٨١

# هەڵسەنگاندن

**فوئاد مەجید میسری**

هەڵسەنگاندنی هەر کارێکی ئەدەبی بە پێوانەی ئیستاتیکای زانستی بەر لە هەموو شتێك پێویستی بە تێگەیشتنی ئەو یاسایانە هەیە کە خودی نووسەر بەواقیعەوە گرێ ئەدەن . هەر وەك ئەم تیورە زانستی‌یە بەسەر رەخنەگردا ئەچەسپێ نووسەرو هونەرمەندیش ئەگرێتەوە . جا ئەگەر نووسەرو رەخنەگر لە هەمان روانگەوە تەماشای مەسەلەی داهێنانیان کرد ، ئەوا کاری رەخنەگر سووکترو ئەرکی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی کەمتر ئەبێ‌و ناوەرۆکی بابەتە رەخنەلێ‌یەکەیش ئەبێتە شیتەڵ کردن‌و دەرخستنی رادەی هەڵس‌وکەوتی نووسەر لەتەك بابەتەکەدا خۆ ئەگەر نووسەرو رەخنەگر ، رێ نومایی دوو بنچینەی فەلسەفی جیاوازیان کردو پێوانەی ئیستاتیکیان دوو قوتبی ناکۆك بوو ، گومانی تێدا نی‌یە مەسەلەکە بەبارێکی تردا ئەکەوێتەوەو ، وەك زۆر جار رووی داوە بەدڵی نووسەر نابێ و بەتوانج‌و تەشەر لە قەڵەم ئەدرێ ، ئەگەر نەڵێم بە تۆبەڵیش جنێوو قسەی ناشیرینی بۆ رەوانە ئەکرێ .

لەباری سەرنجی زانستەوە ، مەسەلەی بنچینەیی لە پرۆسیسی داهێناندا بەرجەستەبوونی ئەو پەیوەندی‌یە توندو تۆڵەیە کە خودی نووسەر بەواقیعەوە گرێ ئەدا ؛ چونکە هونەر بەگشتی‌ی لە رەوتی گەشە کردنی مێژووی مرۆڤایەتیدا هۆیەك بووە بۆ گۆرینی واقیع بەبارێکی باشترو شیاو تردا . ناوەرۆکی ئەو بابەتەی کە نووسەر هەڵس‌وکەوتی لەگەڵدا ئەکا مەبەستی . مرۆڤ‌و خواست‌و ئاواتی بەرامبەر بەژیان دەر ئەخەن . بەکورتی ئادەمیزاد خۆی لەو دونیایەدا ئەبینێتەوە کە بەدەستی خۆی دروستی ئەکا .. بەڵام بنیات نانی ئەو جیهانەیش هەروا کارێکی سووك‌و ئاسان‌و خۆرسك « عفوی » نی‌یە ، چونکە مەحاڵە نووسەر چەند بەهرەمەندو خاوەن سەلیقەی هونەریی بێ ، بتوانێ دونیایەکی بەدڵی خۆی بخوڵقێنێ ئەگەر شارەزای ئەو یاسایانە نەبێ کە بەرێوەی ئەبەن .

سەرپاکی ئەو نووسەرو هونەرمەندو تیۆرلستانەی بەشیری سیستەمی سەرمایەداری گۆش کراون ولە ئامێزی پەیوەندی بەرهەمهێنانی ئەو رژێمەدا پەروەردە بوون ، بە شێوازی جۆر بەجۆر بەرەنگاری ئەم تێروانینە ئەبنەوەو بیانوویشیان ئەوەیە ، گوایە ئیشی ئەدەب‌و هونەر بەگشتی خۆشی‌ی‌و لەزەت گەیاندنە بە مرۆڤ ، تەنانەت هەندێکیشیان بەوەیش قایل نین و زیاتر بێ‌ی لێ هەڵئەبڕن‌و رایان وایە ئەدەب‌و هونەر هیچ ئامانجێکی کۆمەلایەتی نی‌یەو کت‌و مت شتێکە وەك یاری منالان کە بۆ بەسەربردنی کات‌و خۆشی‌یەکی زاتی‌ی ئەنجام ئەدرێ .

لەزووەوە ، واتە لەو سەردەمەوە کە ئادەمیزاد دەست

بەکار بووەو لە پێناوی ژیانیدا هەوڵی دابینکردنی پێویستییەکانی ژیانی داوە ، هەستی بەوە کردووە کە داهێنەرەو خۆشیو لەزەتی لەو بەرهەمە وەرگرتووە کە هێناویەتییە ئاراوە . بۆچی ؟ چونکە بوونو بەردەوامیی خۆی تێدا بینیوەتەوە . لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە خودی نووسەریش بەرهەمی واقیعەو ئەمیان کار لەوو ئەویان کار لەم ئەکا . بەلام لە هەموو حالێکدا ژیان سەرچاوەی هەمیشەیی و لەبن‌نەهاتووی داهێنانە . هیچ جوانییەکیش لەوە مەزنتر نییە کە لە ناخەوە پەرە بە ئاستی هوشیاریی ئادەمیزاد بداو خواستو ئاواتە رەواکانی بخاتە روو .

ئا لەم بۆچوونەوە ، ئەوەندەی دەستی توانام پێی بگاو لەم دەرفەتە کەمەدا ، هەوڵ ئەدەم رۆشنای بخەمە سەر ناوەرۆکی کۆمەلایەتی چیرۆکی «خەمو خەون» ی «رەزا سەید گوڵ»

«خەمو خەون»

ئادەمیزادێك بەکوڵێك خەمو خەفەتەوە ، ئارامی لێبراوەو حەیران و سەراسیمەیە و خۆیشی نازانێ چی بکا . نازانێ ئەو خەمانە چیبوون وا کتو پڕ بوون بەمیوانی .. هەرچەند هەوڵ ئەداو کۆشش ئەکا رووناکییەك بەدی ناکا ، کەسیش نییە گرێ دەروونییەکانی بۆبکاتەوە .. لەم حاڵە دەروونییەدا خەونێکی لەوەوپێشی وەك بروسکە بەمێشکدا دێتەوە یادو بڕیار ئەدا بچێتە لای مەلا تا ناوەرۆکی خەونەکەی بۆ شی بکاتەوە . پوختەی خەونەکەیش کابرایەکی نوورانی سپیپۆشو ریشن راوەستاوەو خەڵکێکی زۆر گوێ قولاخی فەرمایشتەکانی ئەون پێیان رائەگەیەنێ کە «... زەمانێك دادێ پیاوی شارەزاو لێهاتوو پیاوێ لەناو پیاواندا بخوێنێتەوە لێ دەکەوێ .. پشت گوێ دەخرێ .. دیوەخانیان نامێنێ ... پیاوی پیسە پیاو رێزیان دەگیرێ ... پرسو رایان دەکەوێتە دەست ، دەبنە سەربازار .. زینی چاك لەگوێدرێژ دەکرێو کورتانیش لە ئەسپی رەسەن ...» پاڵەوانی چیرۆك پاش ئەوەی تەواوی ئەم خەونە بۆ مەلا دەگێڕێتەوە ، چاوەڕوانی لێکدانەوەی ئەکا ، بەلام سەرەڕای ئەو هەموو کتێبو دەستنووسە کۆنانەی لەبەر دەست «مەلا» دان ، توانای نییە خەونەکەی بۆ تەفسیر بکا ، ئەنجام بە نائومێدی بەجێی دەهێڵێ !.

نووسەرلە ناوەرۆکی ئەم چیرۆکەدا گەرەکیەتی خۆی لەمەسەلەیەکی کۆمەلایەتی گرنگ بدا . ئەو بارە دەروونییەی پاڵەوانەکەی تێدا ئەژی ئەنجامی ئەوەیە کۆمەڵێك دیاردەی ناهەموار لە سەرشانۆیژیان خۆیان دەنوێنن . بۆیە بە پێوانەی ئەو هیچ شتێك لە جێی خۆی نییەو هەموو شتێك ئاوەژووە . بەلام چەواشە بوونی شتەکان لای پاڵەوان پێوانەیەکی تری هەیە ، لەبەر ئەوە ئەبینین ئاوات بەو سەردەمانە ئەخوازێ کە پیاوی ناو پیاوانو خانەدان و وەجاخ زادە ، خاوەنی لاو دیوەخان بوون .. ئاواتە خوازی ئەو جیهانە کۆنەیە کە چینێکی هەڵبژاردەی کۆمەڵ خاوەنی چەندین ئیمتیازی کۆمەلایەتیو رۆشنبیریو سیاسی بوون .. پاڵەوانی ئەم چیرۆکەمان بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکا ، دووچاری نامۆیی بووەو نامۆییەکە بڕستی لێ بڕیوەو نووسەریشی خستۆتە خانەی رۆمانسییە کۆنە پارێز «محافظ» ەکانەوە .

مەسەلەی بنچینەیی لەپرۆسیسی داهێناندا ئەوەیە نووسەر بتوانێ لە پەیوەندی دیالێکتیکی نێوان دیاردە جەوهەرێتێ بکا . نووسەری بە تواناو پشت بەستوو بە تیوری زانستییانەی ئەدەب کە توخنی دیاردەیەکی کۆمەلایەتی ئەکەوێو ئەیکاتە بابەتی چیرۆکەکەی ، بەر لەهەموو شتێك لە جەوهەری ئەو دیاردانە ئەکۆڵێتەوە و بەرەگو ریشەیاندا ئەچێتە خوارێو پاشان رادەی بزووتنو رۆڵی ئەو پەیوەندییانەی بە یەکتریانەوە دەبەدەبەستێ شی ئەکاتەوەو بەووردی لەو یاسایانە ئەکۆڵێتەوە کە ئەبنە هۆی گەشەکردنو پەرەسەندن . بەو پێیە چی دیاردەی نامەفهوم هەیە ـ نەك هەر دیاردە زەقو ئاشکراکان ـ لەتەمو مژی خەووا خەیاڵ دەربازیان ئەکاو رۆشناییان ئەخاتە سەر .

نووسەرێك لەم روانگەیەوە بڕوانێتە ژیانو ئاگاداری هێڵە گشتییەکانی رەوتی بەرەو پێشەوە چووی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بێ ، ئەزانێ کۆمەڵ لە کوێوە دەستی

پێکردووەو بەرەو کوێ هەنگاو ئەنێ . نووسەری لەو جۆرە ژیان لەبارێکی بزێودا ئەبینێ و نائومێدی و پەنا بردنە بەر کیتێبێ کۆن و پەرپووت ناکاتە سەرچاوەی زانین و ئەنجامیش دەست بەتاڵ دابنیشێ . چونکە هەر لەو کاتەدا کە دەستەپاچەیی و هیچ لەبارا نەبوونی کیتێبە کۆنەکان ئەبنە دەستمایەی فەلسەفەی کۆن ، ئاسۆی فەلسەفەی نوێ و ژیانی نوێ لەبەردەم مرۆڤایەتیدا خۆی ئەنوێنێ و موژدەی پاشە ڕۆژێکی شیاوو لەبار بەگوێی جەماوەردا ئەدا .

نەبوونی ئەم تێڕوانینە لای نووسەر دەمانخاتە بەردەم پرسیارێك ئەویش ئەوەیە : ئاخۆ چۆن ئەڕوانێتە ژیان و چۆنی ئەبینێ ؟ ئایا بەتەنها شاهیدێکە بەسەر ڕووداو کارەساتەکانەوە یان ئەندامێکی هوشیاری کۆمەڵەو خۆی لەژان و ئازاری جەماوەردا ئەبینێ و ئازارو ئاواتەکانیش لەخۆیدا ئەدۆزێتەوە .

دوور نی یە چیرۆکنووس مەبەستی ئەوەبێ ، بێ توانایی فەلسەفەی کۆن و کیتێبە زەردەکان لە ئاست دیاردە نوێیەکانی ژیاندا دەرخا دیارە ئەمەیان تاڕادەیەکی باش بە هەڵوێستی ئیجابی پاڵەوان و ناوەرۆکی چیرۆکەکە لە قەڵەم ئەدرێ ، بەڵام کاتێك حاڵ بکاتە ئەوەی لە تێڕوانینێکی سەرو مڕی ڕۆمانسی یانەوە بۆ مەسەلەکە بچێ و لە ئاست فەلسەفەو مەنتیقی مەلادا بێ ئاگاو نەشارەزابێ ، چێژی هونەریی ـ بەو مانایەی لە سەرەتاوە باس کرا ـ لە بەرهەمەکەدا ڕەنگ ناداتەوەو خوێنەر لە بازنەیەکا بەگیر ئەهێنێ .

بڕوانن ... کاتێك پاڵەوان پێشبینی یەکانی کابرای نوورانی بۆ مەلا ئەگێڕێتەوە ، مەلا متەق لە دوو لێوی دەرنایەو سەرەڕای ئەو هەموو کیتێبە زۆرەی بەردەستی ، لەوە بێ تواناترە تەفسیرێك بۆ خەونەکەی بدۆزێتەوە . ئەم جۆرە ڕەسم کردنەی کەسانی ناو چیرۆك لەوە بەولاوە کە بێ ئاگایی و نەشارەزایی دەر ئەخات بەرامبەر بە کۆمەڵگای ئیسلامی ، شتێکی تر ناگەیەنێ کۆمەڵگای ئیسلامی لە سەرەتای دروست بوونی یەوەو بە حوکمی فەلسەفە تایبەتی یەکەی ، زیاد لە پێویست بایەخی بە خەون و تەفسیری خەون داوە

**« لە سەردەمی عەبباسی یەکاندا یەکەمین کتیب لە مێژوودا کە باسی خەونی ئادەمیزادی کردووەو ئەرتەمیدۆرس ی ڕۆمانی ...وسیویە کرا بە عەرەبی ... »**[1]

« ناوبراو باوەڕی وایە کە خەون لە بنچینەدا پەیوەندی بە کەسایەتی خاوەنەکەی و پلەوپایەو نەریت و ڕەوشتی کۆمەڵەوە هەیەو پێویستە ئەو کەسەی خەون لێك ئەداتەوە بەووردیی ئاگاداری ئەو شتانە بێ تاوەکو بەباشی ی ڕەمزەکانی بۆ ھی بکرێتەوە »[1] فەیلەسوفەکانی ئیسلامیش بایەخێکی لە ڕادە بەدەریان بە مەسەلەی خەون داوەو بۆ هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و سروشتی تەفسیری جۆر بەجۆریان کردووەو بەم یان بەو شێوە دڵی خاوەنەکەیان پێ قایل کردووە .. بێ گومان ئەم دیاردەیەیش هەروا لە خۆوە سەری هەڵنەداوە ، بەڵکو یاسا بنچینەیی یەکەی ئاینی ئیسلام کە قورئانە پشتی پێ بەستووە و تەنانەت تێدا پێشبینی ئایندەیشی پێکراوە . ئەوەتا کە باسی هاتنی « مصلح » ێکی کۆمەڵایەتی دەکا ، پێشتر لە ڕێگەی خەونەوە ئاگادار ئەبێ و بەرەمز ئیشارەتی بۆ دەکاو دایك و باوك دەبنە مانگ و ڕۆژو برای هاوپشت دەبنە ئەستێرەو لە بەردەم گەورەیی ئەو پیاوەدا کڕنۆش ئەبەن .[2] ئەوەی لە خەوندا ترێ ئەگوشێ ئەبێتە بادەگێڕی پاشاو ئەوەیشی نانی لەسەر سەرناوەو باڵندە لێی ئەخوا ، چوار مێخە ئەکێشرێ و باڵندە مێشکی ئەخۆن .[3]

---

(1) بڕوانە کتێبی « الاحلام » توفیق الطویل ل 112 چاپی میسر

(1) « الاحلام » توفیق الطویل ل 114 — 115

(2) ئیشارەتە بە سوورەتی یوسف : إذْ قالَ يُوسفُ لابيَه يا ابتَی إني رايتُ احدَ عشر كوكباً والشَمسَ و القَمرَ رايتُهم لي ساجدين « ئایەتی 4 »

(3) قال احدُهمُا إني اراني اعصُرُ خمراً وقال الاخرُ إني أراني احملُ فوق راسي خبزاً تاكل الطيُر منهُ .. « سورەتی یوسف ئایەتی 26 » ..ياصَاحيَ السجنِ اماً احدُكما فيَسقیٰ ربُه خمراً واماً الاخرُ فيُصْلَبُ فتَاكل الطيُر من راسه «ئایەتی 41»

حەوت مانگای لەڵەویش حەوتی لەڕ دەیان ماشنەوەو حەوت گوڵە گەنمی سەوزو حەوتی ووشك ، بەحەوت ساڵ بەپیتو فەڕو حەوت ساڵ گرانیو قاتو قڕی تەفسیر کراوە .[1]
هەر لە قورئاندا کە باسی موسلمانان دەکرێ ، وا تاریف کراون کە لە هەردوو ، دنیادا موژدەیان پێدەدرێ .
« .. لهم البُشرىٰ فـي الحيـاة الدنيـا والاخـرة » .
فـەیلەسووفی ئیسـلام « رازی » ئەم مـوژدەیەی بـە خەون لێکداوەتەوە .[2]
لە « حـەدیث » یشدا بـاسی خەونو پـەیوەنـدی بە ژیـانی ئادەمیزادەوە کراوە . بەرادەیەك وا لێك دراوەتەوە کە خەونی پیاوچاك مـوژدەی هاتنـەکایـەی ژیانێکی نـوێیە[3] پـاشان کەپرسییان ئەو موژدانە چین ، ووترا « هي الرؤيا الصالحة يراها الرجلُ الصالحِ او تُرىٰ لهُ .. »[4] .
جگە لەمانەو دەیان نموونەی تریش کە پێویست بەهێنانەوەیان نـاکا ، کـەسێکی وەك « ئیبن سیـرین » سـەدەیـەك دوای بـڵاوبوونـەوەی ئاینی ئیسـلام بە تـەفسیری خـەون ناوی دەرکردووەو چەند کیتبیشی بۆ ئەو مەبەستە نـووسیوە .[5] ـ « ئیبن خەلدون » یش بەشێکی .
گـەورەی لەکتێبەکـەیدا بـۆ خەون تـەرخـان کـردووە .(1)
سەرەڕای هەموو ئەم کەلەپوورەی لەبەر دەست مەلای ناو چیرۆکەکەدا هەیە ، دەستەوسانە لەوەی تەفسیرێك بۆخەونی پاڵەوانەکەی بهێنێتەوە . دیارە نووسـەر مەبـەسی ئەوەیـە لە خوێنەر بگەیەنێ کە ئەو کەلەپوورە چیتر کوڕو گوژمی نەماوەو لەوە بێ تواناترە دیاردە نوێیەکانی ژیان لێك بداتەوە ... گەر ئەم بۆچـوونەمـان راستبێو نیشانی پێکـابێ ، ئەبێ ئـەو پرسیارەیش بکەین ئاخۆ فەلسەفەی پاڵەوانەکـەی چیە ؟!
بێگومان هەر هەمان فەلسەفەی مەلایە ، دەنا ماناى بۆ نەدە برد .. پاشان ئاخۆ ئەشێ هەر بەو ئاسانییە دەست بەرداری فـەلسەفـەکەی خـۆیو مەلا ببێ لەکـاتێکا مـەلاشووی پێ هەڵدراوەتەوە ؟! .
تۆبڵێی نیشان دانی پیاوێکی پـڕچەك بـەفەلسـەو مەنتیقی ئیسـلام بەو کـوڵەوارییە لەواقیعی ژیـاندا هـەبێو هەروا لەبەردەم لێکدانەوەی خەونێکدا بە چۆکا بێو بانگی نابووتی هەڵبدا ؟!! نووسەر بۆ ئەوەی وێنەیەکی نزیك بەژیانمان بخاتە بەردەست ئەبـوو لای کەم مشتومـڕێکی ئەوتـۆی لەنێوان پاڵەوانە بڕست لێبڕاوەکـەی و مەلادا دروست بکـردایە تـا خوێنەری پێ قایل بکا.
پاڵەوانی ئەم چیرۆکە هەر وەك زەمینەیەکی فیکری پتەوی دژ بە ئایدۆلۆژیای مەلای نییە ، بڕوایەکی بەتینیشی پێی هەیە ، بێ ئەوەی شارەزاییەکی ئەوتۆیشی لەفەلسەفەو نەریتی ئیسلامدا هەبێ .
لەبەر ئەوە هەست ئەکەین پاڵەوانێکی مردووە . مردووە بەو مـانایـەی بڕستی لێبـڕاوە و لەئاست چـەند دیـاردەیەکی چەواشەوناوەژوودا کەتێیان ناگا ، ژیانی لێ بووەتە دۆزەخ .
وەڕس بوونی ئەم پاڵەوانە لە ئاین ، بەڵگەیەکی تری شێوەی تێڕوانینی رۆمانسییانـەی نووسـەرە بەرامبـەر بەژیـان .. چیرۆکنووس کە پاڵەوانەکەی رانەکێشێتە بـەردەم مەلا بـۆ ئەوەیە لە گومانو دوودڵی سەرفرازی بکا ، بەڵام مەلای هیچ لەبـارا نـەبـوو لەوە بێدەسـەلاتتـرە کڵوکـۆی دەروونی دابمرکێنیو ئەنجام نەك وەڕس بەڵکو باوەڕیشی لەق ئەبێ .
دیارە نووسەر ئاگای لەو حەقیقەتە نییە کە بێدەسەلاتی مەلا بەڵگە نییە بۆ دەستەپاچەیی فەلسەفەکەی . لەبەر ئـەوە ، هەڵوێستی پاڵەوانەکە هەڵوێستێکی سەرپێییەو حسابی بۆ نـاکرێ ، ئـەوەندە هـەیە دەبێتـە کلیلێـكو دەرگـا لەسـەر رێبازەکەی نووسەر ئەخاتە سەرپشت .
بە درێژایی مێژووی سەرهەڵدانو گەشەکردنی رۆمـانسیزم نـووسەرانی سـەربەو قـوتانجـانەیـە بۆ خـۆقوتـارکـرن لە

(1) إني أرىٰ سبعَ بقراتٍ سمانٍ ياكلهُنّ سبعٌ عجاف وسبَعَ سنبلات خضُرٍ واخَرَ يابساتٍ « سـورەتی یوسف ئـایەتی ٤٣ »

(2) بڕوانە کتێبی ـ التنبوء بالغيب ـ توفيق الطويل ل 79
(3) « حەدیث » ەکە ئەمەیە « بَقِيَتْ مِنْ بعْدِيَ المُبشراتُ »
(4) بـڕوانـە کتێبی ـ إحـيـاء العلوم ـ الـغزالي ـ ج٤ ل 429 — 430
(5) مەبەست لە کتێبی « تفسير المنامـات الكبير » ی « ئیبن سیرین » ە

(1) بڕوانە « المقدمة » ابن خلدون ل 478

گیروگرفتەکانی ژیان یەکێك لەم دوو ڕێگایەیان گرتووە .. دەستەیەکیان سۆزو ئەندیشەو خەیاڵو سروشتی هێمنو ئارامیان کردووەتە سەرچاوەی هەموو خۆشی‌یەك‌و زاتی خۆیان لەبوون و بەردەوامی ئەوانەدا دیوەتەوە . دەستەی دووەمیش ئەوانەن کە لیرەدا مەبەستمانەو لەتەك ئایدیای نووسەردا یەك ئەگرنەوە ، ئەوانەن دژ بە قەزاو قەدەرە ڕائەوەستن‌و لایان وایە هیچ هێزێکی نادیار توانای ئەوەی نی‌یە دەست لە چارەنووسی ئادەمیزاد بداو گیروگرفتەکانی بۆ چارەسەر بکا . لەبەر ئەوە شانازی بە یاخی‌بوونەوە ئەکەن . شانازیی بەوەوە ئەکەن گوایە چاو نەترسانە لە چوارچێوەی بیروڕای ئاینی دەرباز ئەبن ، بێ ئەوەی گوێ بدەنە هیچ کام لەو یاساو مەفاهیمانەی کە ئاین ڕەنگی بۆ ڕشتوون .
نووسەری ڕۆما لە تێنەگەیشتنی جەوهەری کێشە مرۆڤایەتی‌یەکان پێ بەپێی ئەوەی جیهانێکی خەیاڵی‌و دوور لە واقیع ئەنەخشێنی‌و کوێرانە لە کۆمەڵ‌و نەریتە کۆمەلایەتی‌کان یاخی ئەبێ ، ئەڵێین سەرباری ئەمانەیش تا بینەقاقای لە ڕەش‌بینیدایە . پاڵەوانی چیرۆك سەرەڕای ئەوەی بەهۆی خەونەکەیەوە ، گەرەکیەتی لە سنووری کات و شوێن دەرباز بێ پەروّشی ئەو کۆمەڵگایەیشە کە تێیدا دەستەیەك خەڵکی وەجاخ‌زادەو خاوەن لاو دیوەخان هەڵسوڕێنەری ژیانی کۆمەڵ بوون ... بەڵێ ئایدیای ئەم پاڵەوانە ئایدیای ئەو ڕۆمانسی‌یانەیە کە شارستانیەت بە هۆی نەهامەتی‌ی مرۆڤ لە قەڵەم ئەدەن . بۆیە ئارەزووی ژیانێك ئەکەن دەستی شارستانیەت پێی نەگەیشتبێ تەتانەت لە ئاستی ئەو ڕۆمانسی‌یانەیشدا نی‌یە کە دژ بە تەکنیك و زانست ئەوەستن‌و لایان وایە هۆیەکە بۆ شێواندنی ئادەمیزادو دەروونی خاوێن‌و بێ‌خەوشی مرۆڤ . تەنانەت گەر لەم ڕوانگەیەشەوە تەماشای ژیانی کۆمەڵ بکردایە ، لای کەم داوای لێ ئەکرا دەست بۆ دیاردەی لەوە گرنگتر رابکێشی ، نەك
هەرەس‌هاتنی دەسەلاتی ئوروستوکراسی بکاتە بەهانەی تێکچوونی « قیم » ە کۆمەلایەتی‌یەکان .

بەش بە حاڵی خۆم دڵنیام لەوەی نووسەر ئاوات بە سیستەمی دەرەبەگایەتی ناخوازێ‌و پەروّشی ئەو ڕژێمە بۆگەنە نی‌یە ، بەلام دیاردەی نوێ‌و ناهەموار وای لێ دەکەن مێژوو لە بارێکی بزێوو پەرەسەندوودا نەبینێ . ئەو کەدەست بۆ دیاردە نالەبارەکان درێژ ئەکا ، بەتەنیا بەلاوەکی‌یەکانەوە ئەگیرسێتەوەو ناتوانێ خۆی لەقەرەی سەرەکی‌یەکان بدا . دیارە ئاگای لەوە نی‌یە کە هەرەس‌هاتنی سیستەمی دەرەبەگایەتی لەگەڵ خۆیدا دابەش کردنی کارو کەڵەکە بوونی سەرمایەو نامۆبوونی مرۆڤ لەبەری ڕەنج‌و تەقەللای خۆی‌و دادۆشین‌و چەوساندنەوە ، دەهێنێتە کایەوە .

بەڵگەیەکی تری تێڕوانینی ڕۆمانسی‌یانەی نووسەر ئەوەیە خەون لەجێی حەقیقەت دائەنێ‌و وەك هەر نووسەرێکی ڕۆمانسی خەون بەسروش « إیحاء » ێك دەزانێ بەهۆیەوە مرۆڤ لە حەقیقەتی خۆی تێ ئەگاو خۆی لە خۆیدا خاسی‌یەتێکی ژیانەو لەهەموو دیاردەیەکی تر ڕاستترەو دەلالەت لە خاوێنی‌ی دەروون‌و ڕاستگۆیی مرۆڤ ئەکاو ئەڵقەیەکە ژیان‌و ئادەمیزاد بەیەکەوە ئەبەستێتەوەو ڕێگایەکە شتە نادیارەکان ساغ ئەکاتەوە .
پاڵەوانی چیرۆك کە خۆی لە ژیانە جەنجاڵەکەدا ئەبنێتەوە ، هەست بە ناتەبایی ئەکا ، ئەیەوێ ژیان بەو جۆرە نەبێ کەچی خۆیشی هیچی لەباردانی‌یە . ئەم پاڵەوانە بێ‌ڕەنگ‌و نیشانە ، ئەنجام لە نائومیدیش زیاتر هیچی دەستگیر نابێ‌و لەدوایین لێکدانەوەدا کۆمەڵە کۆنەکەی ئادەمیزاد تێدا تا رادەیەك سەقامگیر بووە بە چاکترین چارەسەری باری ژیانی خۆی دەزانێ . وا دیارە لەو حەقیقەتە تێ‌نەگەیشتووە کە چ پلەو پایەی کۆمەلایەتی قۆناغی دەرەبەگایەتی‌و چ خەوو خەیاڵی نەزۆکی ئادەمیزادی قۆناغی سەرمایەداریێتی بەری درەختی فەردی‌یەتن .
هەر ئەم فەردی‌یەتەیش وای لێکردووە ، تاکڕەوی بکاتە هۆیەك بۆ خۆپاراستن‌و گیرخواردن لە تەوەری زاتی خۆیدا .. ئەوەتا بەرامبەر بەکۆمەڵ‌و سەرجەم یاساو نەریتە باوەکان ئەکەوێتە ناکۆکی‌یەوە ، بێ ئەوەی هەست بەوە بکا کە تاکەکەس خۆی لەخۆیدا بریتی‌یە لەچەندین پەیوەندی کۆمەلایەتی . نووسەر خودی مرۆڤ ئەکاتە حەقیقەتو میحوەری هەموو شتێك‌و جیهانێکی سەربەخۆو بێ‌پەیوەندی

بنیات دەنێ . لێرەوە هەستو سۆزو سەربەستی تاکەکەس ، لای نووسەر ئەبێتە جەوهەری هەموو مەسەلە کۆمەڵایەتی یەکان . بێگومان ئەم هەڵوێستە کۆمەلایەتی یەی وای لێ ئەکا نەتوانێ لە ناکۆکی یە کۆمەلایەتی یەکان تێبگا . سەرەنجام پاڵەوانێکی دووفاق ، ناکۆك ، ڕاڕامان بۆ دروست ئەکا .. پاڵەوانی ئەم چیرۆکەمان بەری ئەم جەشنە بیرکردنەوەیەیە . کەسێکی لاوازەو بەتەنیا روو بەرووی کۆمەل ئەبێتەوە . وونە ، حەیران و سەراسیمەیە ، گومان بڕستی لێبڕیوە ، وەهم ئابلووقەی داوە .. تواتای ململانێ وبەر بەرەکانێی نی یەو نایەوێ بکەوێتە گێژاوەوە ، بۆیە سووكو ئاسان خۆی قوتار ئەکا . دژی واقیعێکی بەزۆر سەپێراوەو بەکوڵو دڵ مەبەستی یە کۆمەل لە دیاردەی ناهەموار پاك ببێتەوە ، بەلام چاو لەئاسۆی دوور ئەنووقێنێ ، کۆمەلی کۆن بە باشترو گونجاو تر ئەزانێ ..

بنچینەی تێڕوانینی نووسەر بێ ئەوەی هەست بەخۆی بکا لەتەك فەلسەفەی ئایدیالیزمدا یەکانگیر ئەبێتەوە . بەتایبەتی کەبۆمان روون بووەوە « ذات »ئەکاتە بناغەی هەست پێکردن و مەوزوع لە پاشکۆی « ذات »دا ئەنێ . هەڵگری ئەم فەلسەفەیە مەوزوع بە دەستکردی ذاتو رادەی لێ تێگەیشتنی دائەنێن ، دیارە ذاتیش بەپێی ئادەمیزادو ئاستی هوشیاریی ئەگۆڕێ ، کەوابوو هەر ذاتە بەپێی بۆچوونی خۆی جیهان دەنەخشێنێو جیهانی ناوەوەی مرۆڤ دەبێتە بنچینە تێگەیشتنی دەوروبەرو هەستو سۆزی تایبەتی بە سەر عەقڵو پراکتیکی کۆمەلایەتیو تاقیکردنەوەی مرۆڤایەتیدا زاڵ ئەبێ . لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە نووسەری سەر بەم ڕێبازە فەلسەفی یە ، دونیایەك ئەخوڵقێنن بناغەیەکی مەوزوعی ی نی یەو کەرەسەکانی ذاتی نووسەرە نەك واقیعی ژیان ، ئەوەیشی کە رای گرتووە هەستو سۆزی تاکە کەسە : جا ئەگەر لە بواری کۆمەلایەتیدا - بەو پێیەی کە ئەدەبش دیاردەیەکی کۆمەلایەتی یە - ذاتی مرۆڤ بکرێتە سەرمەشقی بیرکردنەوەو بناغەی داهێنان ئەنجام عەقل رۆلی نامێنێو سۆزی تاکەکەس جێگای دەگرێتەوە . هەست بەسەر مەنیتقدا زاڵ ئەبێو بەهرەی

رووت لەجێی تێگەیشتنو خەیاڵ جێگەی واقیع ئەگرنەوە و راستگۆیی هونەر ییش لەگۆڕێ نامێنێ .

**کەس نی یە نکوولی لەو حەقیقەتە بکا کە ژیان پڕیەتی لە دیاردەی نالەبار و هەریەکەیان ئەشێ بکرێنە بابەتی چەندین بەرهەمی ئەدەبی . بەلام ئەرکی نووسەر ئەوەنی یە لە ذاتی خۆیەوە تێیان بڕوانێو مەوزوعی یەکانی فەرامۆش بکا . هەروەك ئەرکی نووسەریش ئەوەنی یە وێنەیەکی فۆتوگرافی واقیع بکێشێو پێویستە خەیاڵ ئاوێتەی بەرهەمەکەی بێ . بەلام خەیاڵێك لە زەمینەی ناکۆکیە کۆمەلایەتی یەکانەوە سەرهەلبداو لەبەر رۆشنایی ئەو یاسانەدا چاو هەلبهێنێ کە ژیان بەڕێوە ئەبەن .**

گومان لەوەدا نی یە کە هەلبژاردنی بابەت هەنگاوی یەکەمی پرۆسیی داهێنانی نووسەرە . چیرۆکنووسی بەسەلیقە ئەتوانێ لە بچووکترین دیاردەدا ، بابەتی خۆی هەلبژێرێ . بەهەمان شێوەیش چیرۆکنووسێکیش قەلەمی سوارو لەبار نەبێ لە گەورەترین دیاردەی کۆمەلایەتیدا ناتوانێ چیرۆکێکی سەرکەوتوو بەرهەم بهێنێ . بابزانین ئەم حەقیقەتە لە چیرۆکی « خەمو خەون »دا چۆن بەرجەستە ئەبێ . چیرۆکنووس بەرەنگاری مەسەلەیەکی گەورە بووە بەلام سەرکەوتووانە نەیخستۆتە قالبێکی هونەری یەوە . پاڵەوانی ئەم چیرۆکە هەر چەندە لەبارو زرووفێکی سایکۆلۆژی ناخۆشدایەو نووسەر بەچەند رستەیەك لەباری دەروونی پاڵەوانەکەی ئاگادارمان ئەکا ، کتوپڕ کێشە بنەڕەتی یەکەی لەگۆڕێ نامێنێو شوێن مەسەلەیەکی تر ئەکەوێ کە لێکدانەوەی خەونەکەیەتی . ئەمە لە کاتێدا هیچ جۆرە پەیوەندی یەك لەنێوان ئەو بارە دەروونی یەو ماناو هێمای خەونەکەیدا بەدی ناکەین . بەو جۆرە یەکێتی رووداو « وحدة الحدث » کە بڕبڕەی پشتی چرۆکی هونەری یە لە ئارادا نامێنێ .. راستە زۆر جار سروشتی بابەت وا هەلدەگرێ چیرۆك لە رووداوێك زیاتری تێدا کۆببێتەوە ، بەلام لە هەموو حالێکدا یەکێکیان سەرەکی یە وچی رووداوی تری ناو چیرۆکەکە هەیە ئەبنە یارمەتیدەر بۆ تیژکردنی درامای چیرۆکەکە . بەجۆرێکی تر بلێین گەر رووداوە لاوەکی یەکان لە خزمەتی هێلی

ڕوٚشنایی بخاتە سەر باری دەروونی پاڵەوانەکەی .
[ دەی .. دەی کوٚم تا قووڵبیٚ مەلەی خوٚشترە ] ..
[ کەس بیٚخەم نییە ، دنیاکە وای لیٚ هاتووە ، بەس نازانم بوٚ خەمی کوٚن و نویٚ تیٚك دەکەنەوە ، دەڵیٚی خەم موحازەرەم بوٚ دەدا ] [ بەم.هەموو کتیٚبە پەپە زەردو سپیانە مەبەستی خەونەکەم دەدەن بەدەستەوە ]

بەلاٚم لە ڕووی دارشتنیانەوە تووشی ساتمە بووە ، کە پاڵەوان بوٚخوٚی دەدویٚ هەست ئەکەین نووسەر خوٚیەتی . جگە لەوەیش ئەوکەسەی شارەزای سایکوٚلوٚژیا بیٚ ئەو ڕاستییە ئەزانی کە بنیادەم لەگەڵ خوٚیدا بەو جوٚرە گلتو گوٚ ناکا . بڕوانە بە نموونە : [ تەختە ڕەشەی دەروونم موحازەرەی خەم خەریکە پڕی دەکاتەوە . بە کارهیٚنانی دیالوٚژ جگە لەوەی هوٚیەکە بوٚ گەشەپیٚکردنی ڕووداوو کەم کردنەوەی گیٚڕانەوە هانی خوێنەریش ئەدا شوێن پیٚی ڕووداو هەڵبگریٚو ڕوٚشنایش ئەخاتە سەر کەسایەتی پاڵەوان و هەڵویٚستیٚکی دیاریکراو جا ئەو هەڵویٚستە حاڵەتیٚکی دەروونی بیٚ ، یان کیٚشەیەکی کوٚمەلاٚیەتی . سەرباری ئەمانەیش سیمایەکی ڕیالیستی بە ناوەڕوٚکی چیروٚکەکە ئەدا . بەداخەوە سەرپاکی ئەو دیالوٚژانەی نیٚوان مەلاو پاڵەوانی چیروٚکەکە هیچ کام لەو مەبەستانەی بەجیٚ نەهیٚناوە .
ئەم بەرهەمە کە خوٚی لە خوٚیدا چیروٚکیٚکی نیٚجگار کورتەو پیٚویستە کات تیٚیدا لەساتە وەختیٚك زیاتر نەخایەنیٚ ، بەپیٚی ئەو نیشانانەی چیروٚکنووس دایناون زیٚدە ڕوٚیی‌یەکی زوٚری تیایە . دوای ئەوەی چیروٚکنووس باری دەروونی‌ی پاڵەوانەکەی بەچەند ڕستەیەك ئاشکرا ئەکا نیشانەی تیپەڕبوونی کات دائەنیٚ . دیمەنیٚکی ترمان نیشان ئەدا پاڵەوان لەبەردەم مەلا وایە . دیسان نیشانەی تیپەڕ بوونی کات دائەنیٚتەوەو ئنجا لەتەك مەلادا ئەکەویٚتە وتوویٚژ !!.. چیروٚکنووس گەر شارەزایی‌یەکی خەملیوی لە مەسەلەی نیشانەی تیپەڕبوونی کات « نقلة زمنية » دا هەبوایە ، هەروا لەخوٚوە بەکاری نەئەهیٚنان . پاشان زوٚر بەئاسانی ئەیتوانی لە دیمەنی یەکەم خوٚی قوتار بکا بەوەی دەرخستنی حاڵەتە نەفسی‌یەکەی پاڵەوانی ئەکردە دیمەنیٚکی « إستهلال » ی وقفل ئەدا ، ئەوجا دەستی بە چیروٚکەکە ئەکرد ..

هەر وەك لە سەرەتاوە باسکرا ، مەسەلەی بنچینەیی لە پروٚسیسی داهیٚناندا مەسەلەی پەیوەندی هوشیاریی ئادەمیزادە بەواقیعەوە ، گەر ئەدەبیش دیاردەیەکی کوٚمەلاٚیەتی بیٚ و تیٚیدا ژیان ڕەنگ بداتەوە ، ئەبیٚ لەخوٚمان بپرسین ئاخوٚ چی تیٚیدا ڕەنگ ئەداتەوەو چوٚن ڕەنگ ئەداتەوە ؟ گرنگترین خاسی‌یەتی وێنەی هونەریی ئەوەیە لە ناوکشتیدا تایبەتی و بەهوٚی دیاردەوە جەوهەرو لە تاکە کەسیشدا نموونەی گونجاوو شیاو پیٚشکەش ئەکا . هونەری ڕاستەقینە بە تەنیا دیاردەکەمان ناخاتە بەردەست بەڵکو جەوهەرەکەی نیشان ئەدا . نووسەر کە تاکەکەس هەڵئەبژیٚریٚ ئەبیٚ نموونەبیٚ بوٚ دەیان و سەدان کەسی ناو کوٚمەڵ . هەرچەندە تاکە بەلاٚم لە هەمان کاتدا دەرخستنی گشتیشە . هەمیشە تاکە کەس کە دەکریٚتە پاڵەوان تاکیٚکی نموونەیی‌یەو لەبارو زرووفی خوٚیدا و لەژیٚر کارتیٚکردنی کوٚمەڵیٚك هەڵو مەرج و پەیوەندی کوٚمەلاٚیەتیدا نەبیٚ نایەتە ئاراوە .
ژیانیش لەباریٚکی بزیٚوو گەشە کردوودایە و بەردەوام ڕووەو پیٚشەوە هەنگاو ئەنیٚ و داینەموٚی هەموو گوٚڕانیٚکی کوٚمەلاٚیەتی و تەنانەت سروشتی و فیکریش ناکوٚکی‌یە . ئەو تاکەی چیروٚکنووس ئەیکاتە پاڵەوان ئەندامیٚکی کوٚمەڵەو بەپیٚی هەڵو مەرجی ژیان لە ململانیٚدایە ، لەبەر ئەوە هەرگیز ناشیٚ دووربیٚ لە دەرخستنی ناکوٚکی‌یە ڕاستەقینەکان .
نووسەر هەرنووسەریٚك بەهوٚی ئاشکرا کردنی ڕوٚڵی تاکیٚکی نموونەیی‌یەوە ، بیروڕای سیاسی و ئەخلاقی و فەلسەفی
چینیٚکی دیاریکراو ئەخاتە بەردەست و وەك ئەرکیٚکی میٚژوویی هەوڵی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی کوٚمەڵ ئەدا . لەبەر ئەوە هونەری ڕاستەقینە بەتەنها وێنەی واقیع ناگریٚ بەڵکو پەیوەندی‌یەکانیشی دەرئەخاو تەقەللای گوٚڕینیشی ئەدا .

# نامۆبوون و چەند نموونەییێ لە چیرۆکی کوردیدا

د. نافیع ئاکرەیی

**سەرەتا :**

نامۆبوون : واتە « اغتراب » کە لە فیعلی « یغتـــــرب » وەرگێراوە و لە فیعلی ئینکلیزی (Alienate) هاتوە مانای ئەوە دەدا کە شتێك غەریب بی لە هیندە شتی تر یان شتێکی تایبەتی بەکەسێك ببێ بە مولك و سامانی کەسێکی تر(1) .

یان وەك زاراوە بە مانای دوور کەوتنەوەو نەبونی سولتەو لێك جیاوازبون چێ لەگەڵ زاتی خۆیدا یان لەگەڵ دەوروبەردا دیسـان ناخۆشیو دڵ تەنگیو شەپرزەییو تاكو تەنهاتیو نەبونی هیچ مانایەك بۆ واقیعی ژیان دەگەینێ(2) هەر وەسا (Alinetus) لاتینی بە مانای ئەوە دێ کە مرۆڤـەك خـــاوەنی زاتی خۆی نەبێ(3) .

واتە نامۆبوون بەمانای جوداو جیاوازبون لە هەر شـتێك بەڵام چونکە هەر جودایيەك هەستی ناراحەتیو بێ ئارامی لەگەڵ دایــە .

لە بیرو فیکری ئایینیدا : بە مانای گوناەو خەتیئە دیننـە بەر چاو(4) هەر وەسا هیندەك ژی دەلێن نامۆبون مانای ئەوەیە کە مرۆڤ بگەرێتەوە سەر هیندەك رەوشتی ئاژەلیو کـــەم ژیریو دووری لە رەگەزو ئەسالەتەوە زیاتر لەوە دەرهێنـانی مرۆڤ لە توخیبو سنورەکانی مرۆڤایەتیو دوورکردنەوە لـە مانایەکانی ئینسـانی(5) .

شیکردنەوەی ئەم مەسەلەیە وەك پەیوەندی لـەبـەینی ا و ب (6) .

بۆ نمونە : « ا » مرۆڤێکە .. کەســـێکە .. کۆمـەلـە کەسێکە ... بچینەك یان نەوەیەکە « جیــل » یان میللەتێـکی تەواوە .

« ا » زانراوەو ناسراوەو دەناســـرێت ... ئەم « ا »ە هەستو شوعور بە نامۆبون دەکا بەرامبەر بە « ب » .

« ب » زۆر وینەو ناوەروك وەردەگرێ بەڵام ئەبێ بناسرێو ئاشکرا بکرێ ... چونکە لە زاتو دەرونی خودی مرۆڤ ئەم « ب »بە دەست پێ دەکا یان ئەبێ کەسێك بێ بۆ نمونـە وەك باوكو داكو ژن منداڵ یان ئەبێ کۆمەلێك بێ وەك خێـزان یـا دراوسێ یان هاورێو هەڤاڵ .

لێرەدا « ب » مانای ئەوانەی تـر دەدا « دیـگەران » . یان ژی ئەو کۆمەڵو کۆمەلگایەیە کە مرۆڤ تێدا دەژی . هەر وەك گوتمان دیسـان « ب » دور نیە کەسایەتی یان لایەك لـــە کەسایەتی مرۆڤ بێ .

« ب » دەشێ سروشت بێ یان گەردون بێ . یـــان ئـەو کارە بێ کە مرۆڤ ئەنجامی دەدا یان بەرهەمی کارەکە خۆی بێ.

دوور نیە کە « ا » و « ب » زۆر پەیوەندیان هــەبێ لــە پێشــــــــــان بەڵام لـــە ناکاو یان پلە پلە لـە پاش چەنـد ساردبونەوەیەکدا « ا » هەسـت بە نامۆبوون دەکا بەرامبەر بە « ب » و وا هەست دەکا کە ماوەو دولێکی زۆر پانو بەرینو قولیان لە بەینیاندا هەیە .

لێرەدا ئەگەر لێوردبینەوە دەبێ وا دیار بێ کە « ج » ژی هەیەو کارێکی کاریگەر دەکاتە سەر پەیوەندی « ا » و « ب » چونکە ئەم پەیوەندییە وا دیار دەکا کە « ا » یان خودی « ب » کە پەیوەندیەکی پوزتیف واتە ئیجابییان هەبوە بەڵام یەکـەك لەوانە پەیوەندیەکی پوزتیف لەگەڵ « ج » کردوە لەبەر ئــەوە ئەم هەستە واتە نامۆبون دروست بوە لە بەینیاندا . لێــرەدا وابزانم ئەتوانین بلێین کە مەفهومی نامۆبون دورکەوتنەوەیــە لە کۆمەلگاو ژیانی تاكو تەنهایی یــان تاتەوانی رێکبون لــەگـەڵ خەلکدا ... دیـسان سەرنەکەوتنی هەوڵدان بۆ رێک کەوتنو تیکەل بون لەگەڵ واقیعو وەزعی باو لەناو کۆمەلگادا .

دیسان ئەبێ ئەوە ژی لە بیر نەچێ کـــە ئەو مانایـە ژی دەگەینێ کە مرۆڤ هەموو شت بە بەرەلڵاییو بێ بـەهــایی بگرێو هەست پێ نەکردنی گەرانەوە بۆ رەگەزو ئەســل ... دیسـان نەبوونی هەست بە مانای ژیان(7) .

■ **کورتە مێژویەك**

باسی نامۆبون ئیــــــــستاکە دەکرێ وا دەزاندرێ کـــە پەیوەندی بە نوسینەکانی هیگلو مارکسەوە هەیــە بەڵام زۆر کۆنترە لە زەمانی ئەمانە . باسی ئــەم دیاردە کــراوەو بـــە

تێڕوانینەکی فەلسەفی تەماشای ئەم حالەتە کراوە لە کاتو چاخێکی زۆر زوودا .

هەر وەك هیگل لە کتێبەکەیدا « ظاهریات الروح » کە لە سالی 1805 بلاوکراوتەوە فەسلەکی تەواوی دوورو درێژ کە لە « 100 » لاپەڕەیە باسی روح دەکا کە نامۆیە لە زاتو کەسایەتی خۆی بە ناوی رەوشەنبیری لە دوای ئەم فەسلە فەسلەکی تری هەیە باسی رەوشتو ئەخلاق دەکا کە ئەو ژی لایانکی نامۆبونە . بەلام لە بەیانی شیوعی کە لە سالی 1848 دا دەرچووە مارکس نامۆبوون بە « هراء فلسفی » لە قەلەم دەدا (8) .

بەلام لە پاشان لە فیکری کومونیستی دا وا دیارکرا کە ئەم دیاردەیە بێ بە وێنەو سیفەتی کۆمەلگای پیشە سازیو سەرمایەداری بە دەلیلی ئەوە کە مرۆڤ دەبێ پارچەیەك لە ئامێرەکانی ئەم پیشەی کەتێدا کاردەکاو ئەم دیاردەیە وا ئاشکرا کراوە کە لەگەل دەرچوونو بلاوبونەوەی رژێمو فیکرو بیری سەرمایەداری لە کۆمەلگایەکانی پیشەسازی دا دەرچووە . . . بەلام ئەمە دوورە لە واقیع چونکە ئەم حالەتە پەیوەندیەکی پتەوی هەیە لەگەل دەروونی مرۆڤدا و مرۆڤ ژی هەر مرۆڤە لەهەر جیگایەك یان لە هەر کومەلگایەك دا بژیت لەبەر ئەوە ئەبێ بزانرێت کە نامۆبون دیاردەیەکی مرۆڤایەتی‌یە لە هەموو جۆرە ژیانەکی کۆمەلایەتیو هەموو کۆمەلگایەکانی دونیادا هەیەو دەبێ . دیسان لە ناو هەموو شارستانیەتیو رەوشەنبیری جیهاندا هەیە . . بەلام چونکە لە کومەلگاکانی پیشەسازی ئالوریان لەم دیاردەیە دلوتەوەو لێی کۆلیتەوە . . لەبەر ئەوە هێندەك وا هەست دەکەن کە تایبەتی‌یە بەم کۆمەلانە بەلام وانیە .

زۆر لێکۆلینەوەو پشکێنەر وا لە قەلەم دەدەن کە دیاردەی نامۆبونو لێکۆلینەوەی . . . لە سەر کاتو چەرخی هیگلو هاوریەکانی دەست پێکراوە بەلام وانیە . .

چونکە زور شت هەن پەنجە بۆ ئەوە رادەکێشن کە مەفهومی ئەم دیاردەیە چارەسەر کراوەو پشکێنراوە لە پێش ئەم کاتەو دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانیەکان هەر وەك هێندەك دەگەرێننەوە بۆ ئەفلاتونو فەلسەفەکەی دیسان بۆ فەلسەفەی لاهوتی مەسیحی .

لەبەر ئەوە ئەتوانم بلێم کە نامۆبون لە هەموو چاخو کاتێکدا هەبوە بەلام هەمیشە بەیەك وێنە نەبوە چونکە ئەم دیاردەیە بەپێی کۆمەلگاو پلەی رەوشەنبیری جەماوەرەکە دەگۆرێو پەیکەر دەگرێ . بەلام ئەو هۆیانەی ئەم دیاردەیان زیاتر هێناوەتە بەرچاوو دیاریان کردوە ئەمانەن :ـ زیاد بونو بلاوبونەوەی رەوشەنبیری جەماوەرو دیسان زۆر بونی خەلكو گەلەك بونی دەزگاکانی راگەیاندنو بلاوکردنەوەو ئاسان بونی چاپی کتێبو گۆڤارو رۆژنامە هەروەسا مال نەماوە تەلەفزیونی تێدا نەبێو شار نیە سینەمای نەبێ .

لەبەر ئەم هەموو ئەو شتانەی باسم کردن وا دیاردەکەوێ کە ئاخوتنی سەرنفیسەری گۆڤاری « عالم الفکر » بەراستی دێتە بەر چاو وەك دەلێت :ـ

« نامۆبون حالەتێکی رووت نیە کە پەیوەندی بە کۆمەلگایەکی ناسراوو زانراوەوە هەبێ یان بە رێکخراوێکی کۆمەلایەتی یان رژێمەکی ئابوری تەنها وە هەبێ بەلکو دیاردەیەکی وا ئاشکرایە کە ئەتوانێ دیراسەت بکرێت لە هەموو جۆرەکانی ژیانی کۆمەلایەتی دا . . »(9) .

هەر چەند بێ گومان وا دەردەچێ کە لە ئەنجامی هەبونی هێندەك مەرجو بارو زروفی تایبەتی ئەم دیاردەیە زیاتر بە بەرچاو دەکەوێ . . هەر وەسا توندی هاتنە پێش چاوی ئەم دیاردەیە پەیوەندی بە جیاوازیی ئاستی رەوشەنبیری مرۆڤو کۆمەلەوە هەیە لەناو کۆمەلگای جیاواز جیاوازدا . لە دوای ئەم سەرەتایەدا ئەتوانم بلێم کە والدیارە لە ئەنجامی هەموو پشکنینو ئەو باسانەی لە سەر نامۆبون کراونو دەکرێن بەچاکی ئاشکرا دەبێ کە ئەم دیاردەیە پەیوەندی تەواوی هەیە بە وەعی مرۆڤایەتی . . . دیسان بەچاکی لە دیراسەتی سایکولوژی دیار دەکرێت کە تەعبیرو دەربرین لە ئازادی مروڤ دەکاو هەر ئەبێ هەبێ تا مروڤ لەناو کۆمەلدا هەیە(10) . . چونکە لێرەدا ئەبێ بزانینو دان بەوە بنێن کە جیاوازی هەیە لە بەینی ئەو شتەی هەیەو ئەو شتەی مرۆڤ حەزی لێ دەکاو هیوای ئەوە پێی بگا لەم بوارەدا نامۆبون دروست دەبێ لە لای مرۆڤ و لەناو کومەلدا . .

. . لە هەمو کومەلگایەکانی جیهاندا بەبێ ئەوەی تەماشای ئاڤاهیو بناغەکانی کۆمەلایەتی و سیاسیو ئابوری ئەم کومەلگایانە بکرێن . نامۆبوون لە کومەلگایەکانی سەرمایەداریو پیشەسازی لە رۆژ ئاوادا دیارەو بە وێنەی رەفز و یاخی بوونو لە توخیبو سنوری رەوشت و نەریتی کۆمەلایەتی دەرچوونی خەلك بەتایبەتی گەنجەکان ، دیسان لە کۆمەلگایەکانی سۆشیالستی کە گرێمان لە چەند دەنگی رەفز دەبێ . .

بەلام بلندبوونی دەنگی رەوشەنبیران لە جیهانی سێیەمو ولاتە هەلکەوتوەکان وینەیەکی چاکی نامۆبوونە لەم کومەلگانەدا چونکە ئەوانەن لە رووداوەکانی دەوروبەریانو بارو زروفی میللەتەکانیان تێدەگەنو شێدەکەنەوەو لێدەکۆلنەوە لەبەر ئەوە دیسان ئەتوانم بلێم کە هەموو کەسێكو لە چ چینەك و چ

ئاستێکی رەوشەنبیری هەبێو لەناو هەر کومەڵێکدا بــــژی و زیندەگی بکا تووشی ئەم حالەتە دەبێ وەك دیاردەو حالەتێکی « صحی و ایجابی » چونکە ئەگەر کەسایەتی مرۆڤ لــە خۆی رازی بێو لە تواناو هێزەکانی واسیق بێو هەموو ئابلوقــەو توخیبەو سنورو دیوارەکان بروخێنێو رەفــز بکاو لەبــەندو قەیدان یاخی ببێ بەلای ئیجابیەتی ئەم دیاردەیــــە دەڕواتو کەسایەتی مرۆڤ ئازادیو رێگای راستەقینەی خوی دەگرێ و پێدا دەچێ ... بەڵام ئەگەر ئەم کەسە .. ئــەم مرۆڤە .. ترساو خۆی کۆکردەوەو ئابلوقەداو کشاوە لە کومەل .. وای لێ دێ کە بێ توانا بێو هیچ هێزی جوالانەوەو الفلفینی نەمێنێو ناتوانێ رافیزو یاخی بێو وێنەو دیاردەکانی حالەتی نیکتیڤی ـ سەلبی ـ نامۆبون لێ دیار دەکرێنو سرداب دروست دەبێو دەرچون لە رەوشتەو نەریتەکانی کومەل بــــاو دەبێ .. و دورکەوتنەوە لە خەلك بۆ ئەوەی کەبتەو هێزە دەرونیــــەکانی مرۆڤ دەربچن وەك بەرەللای سیکسی لە رۆژ ئاواو دەستپەر لە ڕۆژهەلاتو یاخی بونو دەرچون لە هەمو بەهــا و کێشو مەیارەکانی کومەل(11) .

## دابەشکردنی جورەکانی نامۆبون :

دستوفسکی لە وتارەکدا رەددی ئەوانە دەدا کە دەڵێــن مرۆڤ خێر خوایە بە سروشتی خۆی « الانسـان خیر بطبعه » و دەڵێت : « وا لەسەر مرۆڤ چەسپاوەو نوسراونەوە کە هــەر لەسەر بەرابەری و تەحەددی هەمیشەی بژیت .. لـــــەم تەحەددیەدا بیرو فیکر ژی هاوبەش بوونە ... لەکاتی ئەرستوو ئەوانەی تری کە بەدوایدا هاتون و تا ئەو ژی .. چونکە مرۆڤ پێویستی تەنها بە بەختیاری نیە ... خوی ژی ئازاری خۆش دەوێ ...

زور جار بە ڤیانەکی توند ئەم ئازارەی خۆش دەوێ ... لەبەر ئەوەی کە واقیعی خۆشبەختیو بەختیاریو ئــــازار هەر لەیەك سەرچاوە دەردەچن ئەو ژی « زەمیرە و زەمیر ژی لە وەی گەورەترە کە لەسنوری» 2 × 2=4 «دا بەند بکرێت»(12) وا دیارە مەبەستی دستوفسکی بەرای من ئەوەیە کــە مرۆڤ دەبیا دژی زۆر شت بێ ئەگەر دژی هەمو شتێك ژی نەبێ ... لەم سروشتەدا دژی ئەوانە رابوەستێ کە لە دەرەوەی خۆ نان تا دەگاتە دژایەتی زاتی خۆی .. چونکە لەناو نــــاخو دەرونی کەسایەتی مرۆڤدا شتێك هەیە وای لە مرۆڤ دەکا یاخی ببی بۆ دوو رێگا ... یان بەرەو رێگای راستو ئیجابی یان ژی بۆ رێگای چەوتو گوناەو سەلبی ... هەر ئەم شتەشە کە وای لە مرۆڤ دەکا بە تەناهیو ئاسودەیی دانەنیشێو رێگای خەبــات بگرێ بۆ هەر لایەك بێ ئیجابی یان ژی سەلبی .

ئەمە ژی پەیوەندی بە بیرو فیکرو هەستو وەعی مرۆڤەوە هەیە کە تا چ رادەیەك هێز دەداتە بەر مرۆڤ کــە بەتوانا بێو دەرونی کار بکاو هانی بدا بۆ پێشکەوتن لە رێگای خەبــاتی خۆیدا بەهەر جۆرو شێکلەك بێ .

لەبەر ئەوەی کە دابەشکردنی ئەم دیاردەیە پەیوەندی بــە مرۆڤو بیرو وەعیو هەستییەوە هەیەو دیــان لە ئاســـتی رەوشنبیری ئەم مرۆڤەوە هەیە ئێجا دابەشـــکردن بۆ ئــەم دیاردەیە زۆر جۆری جیاواز دیار دەکاو هەر هێندەك بە پێی بیرو رایــان دابەشی دەکــەن هــەر وەك بەپێی بــیرو ڕای سایکولۆجیستەکان بەم وێنەیە دابەش دەکرێت :ـ

1 ـ ناموبون لە کارو بەرهەمی کار ئــەم حالەتە زانــای سوشیالیست مالیڤر لە کتێبەکەی دا Comunity ـ کۆمەلگا ـ لەپاش دیراســــــەتی حالەتی مرۆڤو هەموو گۆڕانکاریەکانی بەسەردا تێ پەر بون لە شکار ونێچر تا دامداری بۆ کشتەو کالو پاشان پیشە سازیو دابەشکردنی کار لەبەینی مرۆڤی کۆمەلدا . تا دەڵێت « چەوتترین ئەنجامی دابەشکردنی کار ئەوە کە مرۆڤ ببێ بە پارچەیەك لەو ئامێرو مەکینەی لــە سەر ئیش دەکا .. وەك برغی یان دەرنەفیس .. تا لە دوایدا کرێکارو کارەکەی ببن بە پارچەیەکی بچوکی بێ بەها لە نــاو کۆمەلی ئامێرو مەکینەو بەرهەمی کارەکە »(13) .

2 ـ ناموبون بە هۆی ئەوە کە مرۆڤ خۆی بلندتر لـــە کۆمەلو مرۆڤو دەوروبەری خۆی بزانێو هەســـــت بــە خۆپەرستی دەکاو خۆی بەهەمو شـــت دەزانێو هیچ خزوعو سەر ئەواندن بۆ کەس ناکا جگە لەو فەرمانانــەی لــە دەرونی خۆیدا بۆی دەردەچی کە پاشان توشی دورکــەوتنەوە لـــە کۆمەلو خەلك دەبێو بە تەنها بژیو تا دوای توشی خەمۆکیو خۆکوشتن ژی دەبێ .

3 ـ ئەگەر رەوشـــتو نەریتەکانی کۆمـــەڵ زۆر توندو توخیبەکانیان ئازادی مرۆڤ ئابلۆقەبدەن کە ژیانی ئەو مرۆڤــە ببێ بە شتێکی بێ ماناو هیچ گرنگیەکی نەمێنێ بە نیســــبەت خۆیو خەلکی تر لەم کاتەدا مرۆڤ لەژێر پالەپەستۆیەکی توندو مەزن دەژی تا ئەو راددەیە کە ئەم مرۆڤە لەخۆیو کۆمەلەکەی نامو دەبێ بەڵام هەر هەولی ئەوە دەدا کە ئەمقەیــدو بــەنــدو ئابلوقانە تێك بشکێنیو لە ژێر جەورو ستەمی نەریتو رەوشتی کۆمەلەکە دەربچێ ... بەهەر رێگایەك بێ تــا بــەرێگای خــۆ بەخت کردن ..

4 ـ دەرچون لەکێشو توخیبو ســــــنورو مەعایری نەگۆراوی کۆمەڵدا یان نەشیانی مرۆڤ بۆ گونجانو رێك بون لــەگــەڵ ئەو گۆرانکاریەکانی لەکۆمەڵدا رو دەدەن بــە هۆی

پەرەپێدانی شارستانیەتی ... لەبەر ئەوە هەر دوو لا وای لە مرۆڤ دەکا کە نەتوانی تەفاعول لەگـەڵ خۆیو کۆمەڵەکەی بکاو لەحالەتێکی نامۆبوندا بژیتو دورکەوێتەوە لەکۆمەڵ . ئەمە ژی دو ڕێگا دەگری :

ا ـ یاخی بوونو رەفزی چ تشتی کۆن یان ئەو شـتانەی دەگۆڕێن ئەمە تا رادەیەك ئیجابیە .

ب ـ خۆ دورکردنەوەو جیـــاوازبون لەگـــەڵ کۆمــەڵو توشـبونی نەخۆشـیەکانی سـایکۆلۆژی ئەمەژی حـالەتێکی مەڕەزیو سەلبی‌یە .

5 ـ نامۆبونی سیکس :ـ لەبەر ئەو هەمو بەندو قەیـدی کۆمەلایەتیو ئاینیو دونیائیو پارەزۆری ژن ئێنان مرۆڤ توشی حالەتێکی سایکۆلۆژیو پالەپەستۆیەکی روحی دەبێ کە ئەنجامی ئەم هەموە هێزانە کەبتەو دوربونەوە لە کۆمەڵەو دژایەتی بەهەمو شتێكو گرتنی ڕێگای ناجوری جنسی‌یە ئەمـەژی لایـەنـەکی نامۆبونە .

6 ـ نامۆبون لە سـروشت : ـ ئـەم جۆرە زۆر وێنـــە وەردەگرێ کـە مرۆڤ نارازی دەبێ لـەو جێگایەی تێدا دەژی وەك :

ا ـ لەبـەر جەور سـتەمی کۆمەڵو هێزەکانیەوە جێگا بەجێ هێلان .

ب ـ دەرچونو بەجێ هێلانی زادگا .

ج ـ مـردنو نـەمانو لەبەر چـاو چونی عەزیزان لـــە جێگایەك .

د ـ یادو بیری چاكو خۆش لە جێگایەك گەر نەمـان وەك ڤیـتان .

7 ـ هـــەر کۆمەڵێك پێویـــستی بەهاوبەشیو یەکگرتنو هاوکاری خەلکی ئەم کۆمەڵەیە بۆ بەجێ ئێنانو ئاشکرا کردنی بەهاو بیرو بڕواو ئایدیولۆژیەکی هاوبەش لەناو ئەو کۆمەڵەداو ئەگەر کەسێك لەم ڕێگایەو لەم بەهاو ئایدیولۆژیەی کۆمەڵەکـە لاداو جیاواز بو بەبێ گومان توشی نامۆبون دەبێ لە کۆمــەڵو لەزاتی خۆی .

8 ـ مل کەچی‌ی مرۆڤ بۆ بەهاو مەعابیری کـۆمــــەڵو دەسەلاتی رژێم وای لە مرۆڤ ئەکا کـــە بەشێك لە ئازادی دەرونی خۆی لە دەست بداو ئەم سەرداننەواندنو مل کەچی‌ی وای لە مرۆڤ دەکا کە کەبتی میولو حەزو هەستی خۆی بکاو توشی نامۆبون ببێ بەلام چونکە مرۆڤ لــــە زاروکیـــەوە وا پەروەردە دەکرێت ئەم شتانە تێدا هەبن لە بەر ئەوە شـــتێکی ئاسای‌یە .

9 ـ ئەگەر یەکەك یان لایەك یێن ئاخو چینەك بەرژەوەندی خۆی بڤێو پێویستیەکانو سودی خەلکی تر بە هیچ بزانێ بێ گومان توشی عەلاقاتو پەیوەندیەکانی سـارد دەبێ لـەگـــەڵ ئەوانەی تر‌داو ناتوانێ پەیوەندی هەمیشە لەگەڵیاندا پەیـــدا بکات . چونکە بەپێ‌ی ئابوری مەتریالی هەر پەیوەندیەك کـــە قازانجو سود بۆ لایەك هەبێو زەرەر بۆ لای تر .. لای دووەم نامۆ دەبێ لەلای یەکەم .

10 ـ هەست بەبێ تواناییو هەژاریو بێ هێزی لەبـەر ئەوەی هەست دەکا کە بەمافی خۆی ناگاو توشی وەزعێك دەبێ کە هیچ ماناو مەغزا لەلای نامێنێ بۆ ژیانیو هەمـو ئومێـــدو هیڤیو هیوایەکانی تێك دەشکێن چ لە مەجالی کار یان ڤیـان یان پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵو دەورو بەرو خەلك تا دەگاتە ئەو رادەیە بیری لەوە بکا کە ناتوانی ئەو شتەی حەزی لێ‌یە بیکاتێو ئەگەر مرۆڤ ژی گەیشتە ئەم حالەتە دەگەڕێتەوە ســـــەر هەستی ئاژەلی خۆی کە لە هەمو شت دەترسێو بەشـتێکی نامۆو خۆی دەبینی لەژیانداو بیر لە هیچ ناکـا جگە لـــە زك پڕکردنو سیکسو ئەگەر زیاتر پێداچو توشی خۆکوشـــــتن ژی دەبێ .

11 ـ نامۆبون بە مانای گواستنەوەو گۆڕانی باری ژیـان وەك لە دەست دەرهێنانی مافەکی راســتەقینەی مرۆڤێك وەك سامان یان زەوی یان هەر شتی دیو دانی ئەم شتە بەکەسێکی تر ئەم کارەژی وای لەم مرۆڤە دەکا کە توشی وەزعێکی نامۆبون ببێو هەمو شت رەفز بکاو یاخی ببێو لەکۆمـەڵ دوربیێتەوەو توشی زۆر نەخۆشی سایکۆلۆژی ببێ .

12 ـ نامۆبونی رەوشەنبیر : ئەوەیە مەوزوعی باسی ئێمە کە مرۆڤی رەوشەنبیر چۆن توشـی نامۆبون دەبێو چۆن رەنگ دەداتەوە لەکارو رەوشتی خۆی بەتایبەتی داهێنەرەکـان وەك شاعیرو چیرۆك نوسو رەسمو زور شتی تر بەلام باسی ئێمە لە چیرۆك دایەو تەئکید لەسـەر ئـەم ڕێگایـە دەکـەین نامۆبونی رەوشەنبیر لەسەر دو وێنە دەبێ :ـ

ا ـ مرۆڤێك کە رەوشەنبیر بێو لە کومەلگایەکدا بژی بۆ نمونە وەك کیشوەرێکی جیهانی سیەم لەگەڵ کۆمەلی خۆی ڕێك بێ بەلام کە دەچێتە کۆمەلێکی پێشکەوتو وەك ئەوروپاو شـتی جیاواز لەگەڵ ئەوانەی لە ناو کۆمەلی خۆی‌دا دەبینێو ناتوانێ لەگەڵدا بگونجێو لەحالەتی نامۆبون دا دەبێ دیـان کـــــە دەگەڕێتەوە ناو کۆمەلی خۆی هەست بەوە دەکا کە چۆن کۆمەلی خۆ ژی بگەینێتە ئاستی ئەوانەی تر لەبەر ئەوە لەکۆمەلی خۆژی نامۆ دەبێ وەك پەندی پێشینانی کوردی دەلێ‌لە کەو لە کرکـاك بووە .

ب ـ مرۆڤ رەوشەنبیر ئەوی داهێنەربێ لەکاتی داهێناندا چ شاعیر یان چیرۆك نوس یان رەسامو هەر شتێکی مەجالی داهینانی تێدا بێ لە دمی داهێنان دا پێویستی بە زروفێکی تایبەتی تەك و تەنهائی یە تا بتوانی لەگەل هەستو بیری کۆببێتەوەو شت دروست کاو ئیبداع دەرینێ چونکە ئەم کاتە بەکاتی داهینان ناو ناوە « لحظة الابداع » ئەم کاتە تایبەتی بە کاتێکی ناموبونە چونکە کە نامو دەبێ ئەیەوێ شت دروست کا بۆ ئەنجام دانی گورانکای لە کومەلگای خۆدا بەرەو چاکتر بەلام ئەم رەوشەنبیرە ئەگەر توانی بەئازادی هەرچی لە دل دایە بیلێ هەر ناموبونەکەی لە کاتی ئیبداعەکەی‌دا دەبێ بەلام ئەگەر ئەم داهێنەرە توشی وەزعێکی تر بوو بەندو سکرو قەدەغە لەبەر چاوی بلندبونو دانران بۆ ئەوکەی داهێنانی بەجێ نەهێنێ ئەم رەوشەنبیرو نوسەرو داهێنەرە توشی ناموبونێکی گەورەتر دەبێ نەهەر لەکاتی داهێنانی بەلکو لە کۆمەلو لە رژێمو لە دەسەلات دارەکانی رامیاری .

ناموبونی رەوشەنبیر پەیوەندی بەچینو کۆمەلەوە نیە چونکە هەر ئاستی رەوشەنبیری گرنگە .. رەوشەنبیرو داهێنەر لەهەر تاخو چینەك بێ چەوساوەو هەژار یان بە دەسەلاتو دەولەتمەند بێ هەمویان توشی دیاردەی ناموبون دەبن بەپێی حالەتی خۆیان .

ئەم رەوشەنبیرو داهێنەرە لەناو کۆمەلدا ئەبێ یەکێك لەمانە بێ : ـ

ا ـ لەگەل ئەو پەرە پێدانو گۆڕانکاریەکانی ناو کۆمەلو رژێم دابێ .

ب ـ یان ئەبێ دژی هەمو گۆرانکاریەك و رژێم بێ .

« لێرەدا ئەبێ ئەوەژی لەبیر نەچێ کە گۆڕانکاریو پەرە پێدان هەر دولا دەگەڕێتەوە چ پێشکەوتنخواز یان پاشکەوتنخواز بێ » ئەو گۆڕانکاریانەی لەناو کۆمەل دەکرێن یان ئەو گۆڕانکاریانەی داهێنەران دەکەنو ئەیانەوێ ببێ هەردوکیان حالەتی ناموبون دروست دەکەن لەناو کۆمەلدا چ کۆمەل بەرامبەر داهێنەر یان بە پێچەوانەوە .

داهێنەران بە وێنەیەکی گشتیو بابەتی باسەکەمان چیرۆك نوسان بە وێنەیەکی تایبەتی تەعبیر لەم حالە ناموبونە دەکەن بە ڕێگای داهێنانی هونەری چیرۆك .. چونکە لەو کاتەی چیرۆك دەنوسنەوە خۆیان نامو دەکەن لە کۆمەلو پاشان لە کارە هونەریەکەیان‌دا تەعبیر لە حالەتی ناموبون دەکەن لەو هەمو جورەکانی کە باسمان کردن بەلام ئەگەر چیرۆك نوس نەیتوانی تەعبیر لەم حالەتە بکا لەبەر هۆی ناتەوانی هونەری خۆی یان قەدەغە کردنیو بێ دەسەلاتی لەم کاتەدا داهێنەر توشی حالەتێکی تری ناموبون دەبێو دور دەکەوتەوە لە کۆمەلو توشی ناموبونی سەلبی دەبێ .

**ناموبون لە ئەدەب دا :**

ناموبون لە ئەدەب بەگشتیو لەچیرۆك بەتایبەتی بە چەند وێنەیەك دیار دەبێ بەلام ئێمە باسە ن لەسەر ناموبونە لە چیرۆکی کوردی داو نامانەوێ زیاتر بابەتی باسەکەمان بلاو ببێتەوە لەبەر ئەوە هەر باسی ناموبونی ئەدیبو چیرۆك نوسی کورد دەکەین هەر چەندە ئەدیبو چیرۆك نوسی کوردی هاوچەرخ خۆی لە خۆیو ژیانی‌دا نامویە . بەلام ئەمەوێ وێنەکانی ناموبونی چیرۆك نووسەکانی کورد دیارکەم کە ئەمانەی خوارەوەن .

1 ـ یاخی بونو تەمەرود دژی واقیعو ئەو شتەی کە هەیەو هەول دان بۆ گۆڕانکاری بەرەو چاکتر .

2 ـ بێ بەهاو بەکەم زانینی بیرو فیکری کۆمەلو ڕۆیشتن بەرەو بەرەللایی « هەر چەندە هەر دوو خال یاخی بون دەگەڕێتەوەو رەفزی واقیع دەکا بەلام بە دو ڕێگای جیاواز » .

3 ـ دوربونەوە لەکۆمەلو جیابونەوە لە خەلكو لە کەسایەتیو زاتی خۆی بۆ ئەوەی گۆڕانکاریەك لە ژیانی خۆی یان ژیانی کۆمەلدا بەجێ بێنێ .

4 ـ دور نیە چیرۆك نوسەك زۆر ناسراو بێ لە ناو کۆمەلدا و هەمو میللەتەکە بە چاکی بناسن بەلام خۆی هەست بە نامویی دەکا چونکە ناتوانی لەگەلدا بگونجێو هەولی ئەوە دەدا بگۆڕێ .

5 ـ هێندەك ئەدیبو نوسەر شت ئەنوسن بەلام وای هەست ئەکرێ کە رەنگە وا بیر بکاتەوە ئەو هێندە خەلکە نیە بە چاکی لەو بگاو ئەدەبەکەی هەرەسی بکا بیگاتە ئاستی خۆی لەبەر ئەوە وا دیار دەکەوێ لەناو نوسینەکانی‌دا کە خۆی نامویە لەبەشی گەورەی کۆمەلگایەکەی .

6 ـ هێندەك چیرۆك نوسەکانمان کە دورە ولات دەبن یان هەست بەم دوریە دەکەن بە چاکی ئەم دوریەو ئەم غوربەتە لە ناو ئەدەبەکەیان دا ئاشکرایەو رەنگ دەداتەوە هەر چەندە ئەم دوریو غوربەتە ئاسایی بێ وەك خوێندن کە لە قوتابیانی دورە ولات دەبینن یان لەبەر هۆیەکانی رامیاری بێ .

7 ـ بەرهەمی هێندەك ئەدیبو چیروك نوسەکان ناگەنە ئاستی تێگەیشتنی کۆمەل یان کۆمەل ئەم بەرهەمانە بە شتێکی کەم دەزانێ هەر چەندە هەردو جۆر بەهای هونەریو ئەدەبی چاکی تێدایە ، ئەم ئەدیبە لەم کاتەدا توشی ناموبون دەبێ یان ئەدیبەکی تر وا هەست ئەکا کە هیچی پێ نەماوە بلێ یان ئەگەر

بلێ خەلك تێ ناگا .. ئەگەر بنوسیت ژی بلاو ناكاتەوە لەبەر هەر هۆیەك بێ هەمو ئەم شتانە وێنەی نـاموبونی ئـەدیبو چیرۆك نوسی كوردن .

8 ـ ئەدیب و چیرۆك نوس كـە شـت ئەنوسنەوەو هونەرمەندانە دەرِازێنێتەوەو دێنێتە بەرهـەم بێ گومـان رەنگدانەوەیەكی راستەقینەی ژیانی خۆیە چ كەم یان زور ئەو هونەرمەندە لەم شتەدا قسەی هیراقلیتس دینتەوە بیر كـە دەلێت « لە خۆم دەگەرِێمو دەكۆلمەوە .. »(14) .

9 ـ زۆر گۆرانكاری لە ئەدەبی كوردیدا كراون بـەلام خەلك ئەم گۆرِانكاریانە نازانیو لە چیرۆك دا هەر چـیرۆكی سوارەی مەریوانی دەویو فەیروزخانو شتی تر بـەلام شتی نوێو گۆرانكاریەكانی ئەدەبی نەو خەلك نازانی لە بەر ئەدیب وا دیار دەبێ كە مونعەزیلە لەبەر ئەوەی كە هەست ئەكا كـە هونەرەكەی بلندەو كۆمەلو میللەت ناگەنێو بە مەبەستی خۆ ناگاتو مافی خۆی وەدەست ناهێنێ لەبەر ئەوە ئەدەبو ئەدیب نامون لە پاش دیاربونی وێنەكانی ناموبی لە لای چیرۆك نوسو ئەدیبی كوردا وا باشە ژی بلێین كە دەرونی ئەدیبەو كـاری ناموبون بە چاكی دیارە لەناو بەرهەمەكانیان داو هێندەك جـار وا دیار دەبێ كە وەك مرۆڤێكی ناتەوان دیارە كە لەگەل ژیـانو لەگەل ئەو كۆمەلگایەی تێدا دەژیو ئەو هەمو گۆرِانكاریەكانی لە ناو كۆمەلدا دەكرێن ناتوانێت بگونجێت .

لە بەر ئەوە زۆربەی ئەدەبی هاوچەرخ نەك هەر لـە كۆمەلگای كوردەواری خۆماندا بەلكو لە هەمو جیهان هەست بە ناموبون دەكرێ كە پەرِی بەسەر ئەدەبەكەوە داهێناوە بـەلام هەر یەكەك بە جورێك ئەم جۆرانە ژی دەگەرِێنەوە بۆ ڤاسـتی تێگەیشتنو رەوشەنبیری كۆمەلو رێكبونو گونجاندنی ئەدیب لەگەل ئەم كۆمەلگاو سروشتەی تێدا دەژی .

**چەند نمونەی ناموبون لە چیرۆكی كوردی دا :**

لێرەدا ئەتوانم جورەكانی ناموبون لـە ناو چـیرۆكی كوردیدا چ لە پالەوانەكانی چیرۆك كە ڤاوێنەی چیرۆك نوسـن یان چیرۆك نوس خۆی بەم جۆرانەی خوارەوە بێنمە بەر چـاو كە هەر جۆرێك هێندەك نمونەی چیرۆكەكانی چیرۆك نوسـانی كوردی خۆمان بۆ تەئكید لەسەر هەبونی ئەم دیاردەیە لە نـاو ئەدەبو چیرۆكی كوردی خۆمان دێنم .. دیسان ئەوە ژی ئەبێ لە بیر نەچێ كە ئەم نمونانە مەرج نیە دەقو دەق نمونەی جۆرێك لە ناموبون بن بەلكو لەیەك چیرۆك دا زۆر جۆری ناموبون هەیەو چیرۆك نوسەك گەلەك جۆری ناموبون لە بەرهەمەكەیدا دیـار دەكلو پالەوانەكانی لـە گێژاوی چـەند جۆری ناموبون دا دەسورێنەوە لەبەر ئەوە ئەگەر ناوی چیرۆكەك لەگەل چەنـد جوردا هات ئەبێ ئەم راستی‌یە لەبەر چاو بێ :

**1 ـ ناموبون لەبەر بێكاریو هەژاری :**

چونكە بێكاریو هەژاری نەخوشیەكی بەتێنی كۆمەلگاكانی پاشكەوتون لە جیهانداو ئەو مرۆڤەی توشی ئەم نەخۆشـیە دەبێ لە هەمو شتێك دورو نامویە جگە لەوەی كە نان بۆ منالو خێزانەكەی پەیدا بكاو هیچ ئاگای لە دەوروبەری خۆی نیە لەبەر ئەوەی كە كومەلی كوردەواری بە توندی توشی ئەم دیـاردە نەخۆشیەیەو چیرۆك نوسەكانی كورد مامەلە لەگەل ئەم جۆرە پالەوانانە كردوەو بەچاكی ناموبۆنی ئەم جۆرە مرۆڤانە دیـارە لەكارەكانیاندا وەك « كارمان ئەوێتەو پەنجـا فلسو بـەلام « ژیانە »ی محمد مەولود مەمو « كێ گوناهبارە »ی ساجـد ئاوارەو « ئاوانم چی بووی » كاكە مەم بۆتانیو « دز »ی ئەمـین میرزا كەریمو « نان بـە رەنجی شان »ی جیهـان عومـەر و $1 + 1 = 1$ی رؤوف بێگـەردو « چەنـدم لێ ئەسینیت »ی مستەفا سالح كەریمو مام هومەری موحەرەم مەحەمەد ئەمینو « ئەمەیە بەشمان »ی د. ڤاوس قەفتانو « حـەسـەنۆك » ی كامران موكریو زوری تریش .

**2 ـ ناموبون لە زاتو هێزی خۆی :**

لەبەر چەند هۆیەكی تایبەتی ئەم جۆرە ناموبونە دیار دەبێ لە ناو چیرۆكی كوردیدا كە مرۆڤو پالەوانی چیرۆك لە خۆی بێ پاكەو بیر لە خۆی ناكاتەوە چونكە یان مەشـغولی كـارێكی گەورەترە لەزاتی خۆی یان لەبەر ترسو جەورو ستەم ناوێری بیر لەخۆیو حالی خۆی بكاو پەنا دەباتە بەر شتی دور لەخۆی وەك خەونو خەیال یان لەبەر ڤیانو خۆشەویسـتی خـۆیو دەوروبەر لەبیر دەچن بەس یارەكەی لەبیر دەمێننەوەو ئـەم شتە دیارە لە چیرۆكی «زفروك »ی ابراهیم سەلمان «لەخەوما»ی جەمیل سائیبو « بوكە خانی » دلشاد مەحـەمەد ئەمینو « گورانی دەربەدەرێكی یاخی بو » ی كاكە مەم بۆتـانی و « خالێك لە پاش ژمارە » ی رؤوف بێگـەردو خۆشەویستی رؤوف بێگەردو « رِق » ی د. كاوس قەفتـانو دیسـان « تورەكە » ی د. كاوس قەفتانو « چیرۆكو عەشـقێكی » حوسێن عارفو زۆری تریش .

**3 ـ ناموبون لە حەزارەتو شارستانیەتی :**

ئەم جۆرە ناموبونە دیارە لە هێندەك چیرۆكی كوردیدا كە پالەوان ناچار دەبێ توشی دەربەدەری دەبێو لە زادگاو ئـەو جێگایەی تێدا گەورە بوە دور دەكەوێ بەتایبەتی جوتیارو دێتە

ناو شارو توشی دیاردەکانی شارستانیەتی دەبێ کـــە ناتوانی لەگەڵدا بگونجێو لێی نامودەبێو ناتوانێ لەگەڵدا تەفاعول بکا یان ئەم شارستانیەتی‌یە کار لە هێندەك بیرو بڕواو نەریتەکانی

ناو کۆمەڵ دەکاو دەگۆڕێو پاڵەوانو چیرۆك نوس خۆی لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریانە ناگونجێنو هەر دەمێنن لە شـــــارستانیەتیو دیاردەکانی لە حاڵەتی ناموبوندا وەك چیرۆکی « بوكو زاوا »ی مەحەمەد فەریق حەســــەنو « خاڵێك لە پاش ژمارەدا »ی رەؤوف بێگەردو « گەشت »ی « گولێکی پێ شێل کراو »ی کاکە مەم بۆتانیو « کاروان سەرای » مەحەمەد رەشید فەتاحو زۆری تر .

## 4 ـ نامۆبون لەپاش ڕوداوێکی گرنك :

ئەگەر مرۆڤێك یان کۆمەڵێك یان میللەتێك لـــە کـــاری رۆژانەی خۆیو ئاسای خۆیدا بژینو ئاگایان لە خۆیـــانو دەورو بەری خۆیان بێ بەچاکی ئیشو کاری رۆژانەی خۆیـان بەرێوە ببـەنو دڵیان پڕ لـــە هیواو هیڤیەکانی رەنگاو رەنگو رۆناك بن بەڵام لـــە ناکاو توشی ڕووداوێکی گرنگ بێنو ئـــەو هەمـــو ئومێدو هیڤیەکانی نـــاو دڵیاندا بروخێنو ئاڤاهیەکانی خەیالی زێرینیان هەرفتن بەدوایدا بێت ... چـیرۆك نوسو پاڵەوانەکانیان توشی ئەم جۆرە ناموبون دەبنو لــــە کیژاودا دەژینو رابـــردو نهـــوو ئایندەیان لێ تێـــك دەچێ تـــا دەمێ تروسکایەکی تر رێگایان پڕ ڕۆناهی بکاتو لەم جۆرە ناموبونەدا دەربێنێ : وەك « قەلەم » و « ژیلەمو » و « ســـێ وێنـــەو رێبوارێکی ماندوی » و « باورنامەی لە دایك بونی گولێك »ی مـــستەفا سالح کەریمو « هەرس هێنانی بـــەندی مەئرەب » و « زیندە بەچاڵ کردنی نەزوکێك »ی کاکە مەم بۆتانیو « کانی رەحمان »ی حوسێن عارفو زۆری تریش .

## 5 ـ نامۆبون لە واقیع :

واقیعو مرۆڤ دوو شتن پێکەوەنو لەگەڵ یەکدا دەژینو تەواوکـــەری یەکەنو بـــۆ حاڵەتی ئاسای بیرکردنەوەو تـــاقی کردنەوەی مرۆڤ پێکەوەن .. ئەگەر یەکەك لـــە یەکەك ترازاو بەپێش کەوت یان لێی پاش کەوت یان یەکەك ئەوی تر بەجێ هێشت بـــە بێ گومان توشی ناموبون دەبن ... ئەم ناموبونـــە حاڵەتێکی وا بە مرۆڤ دەبەخشێ کە لە جێگایەك دانیشتووەو نان دەخواو دەسورێتەوەو جولانەوەو لقلقینیان تێدا دەکا بەڵام لەو وەزعە نامویەدا بـــە چاکی ناتوانێ لەگەڵ دا بگونجێ ... بەلکو لەگەڵ هیندەك شتی تـــردا گونجاوە کە واقیعی لـــە بیر کردۆتەوەو لێی نامویە وەك پاڵەوانەکانی چیرۆکی « رق »و « تورەکە »ی د. کاووس قەفتانو « خاڵێك لە پاش ژمارە » و « گەڕیدە » و « توانەوە »ی رەئووف بێگـــەردو « دو چیرۆكو عەشقێك »و « مەدەد »ی حوســــــین عارفو « کۆچ »ی عەبدوللا ئاگرینو « شایەکەی رەشەی خەجـــەلاو »ی عـــەلاء الدین سەجادیو « مەرگ »ی حەیدەر عەبدوالرحمانو « مام هومـــەر »ی موحـــەرەم مەحەمەد ئەمینو « بورجوازیەکان »و « سێبەری بەر ســـــەنگەری مەرگ »ی کـاکـە مەم بۆتانیو « رەنگەکێ ڤیانی »ی فەیسەل مستەفاو « خەونا بێ وەغەر »و « ڤیـــان »و « کۆمر »ی ئیبراهیم ســـــەلمانو « خاچ »و « ئەسپەشێ »ی موحەمەد فەریق حەسەنو « کاروان سەرای » موحەمەد رەشید فەتاحو زۆری تر ژی .

## 6 ـ نامۆبون لە بەرهەم :

ئەم جۆرە ناموبونە هەر چەندە تایبەتی‌یە بە کۆمەڵگاکانی پیشە سازیو مرۆڤ لەم حاڵەتەدا وای لێ دێ کە لەبەرهەمی کارەکەی نامو ببێو ببێ بە پارچەیەك لەو ئامێرو مـــاکینــــەی کاری لەسەر دەکا بەڵام بەرهەمەکەی نابینێ ... هـــەر چەندە ئەم جۆرە ناموبونە کـــەمـــە یان نی‌یە لـــە کۆمەڵی کوردەواری خۆماندا بەڵام هیندەك چیرۆکی کوردی ئـــەم دیـــاردەیـــە ژی چارەسەر کردووەو لەناو چیرۆکی کوردیدا رەنگی داوەتەوە : وەك « کولارە »ی « ئەستێرەیەك لە رۆژی رونا »ی مەحـــەمەد فەریق حەسەنو « تونیل »ی کاکە مەم بۆتانی .

## 7 ـ نامۆبونی لە سروشتو زادگا :

مرۆڤ کە چاوی دەکاتەوە و ئەو جێگایەی تێدا لەدایـــك بووە دەبینێ ڤیان و خۆشەویستی‌یەکی پتەو لە بەینیاندا پەیدا دەبێو هەر هێزەك بیەوێ ئەم پەیوەندی‌یە لێك جوداکا بـــە توندی مرۆڤ دژی رادەوەستی بەڵام ئەگەر مرۆڤ نـــەیتوانی بەربەرەکانی ئەم هێزە بکا توشی ناموبون دەبێ و لەم سروشتەی تێدا لە دایك بووەو ژیاوە دەردەچێ و مرۆڤ بەدوو ڕێگا توشی دورکەوتنەوە لەم سروشتە دەبێ یان بە ڕێگای ئاســـــای وەك خوێندن یان لە ژێر زەبری ستەمو جەور سروشتەکەی بەجێ دێڵی و توشی ناموبون دەبێو ئەم دیاردەیە بە چاکی مامـــەڵەی لەگەڵ کراوەو لە چیرۆکی کوردیدا و پاڵەوانەکانی بەچـــاکی پەیکەریان گرتووە لەم وێنانەدا وەك «کاروان سەرای» مەحەمەد رەشید فەتاحو « پەنجا فلس » ی موحەمـــەد مەولود مـــــەمو « ئەستێرەیەك لەڕۆژی رۆنا » و « بوكو زاوا »ی مەحـــــەمەد فەریق حەسەنو « گواستنەوە » و « گۆرانی دەربەدەرێکی یاخی بو » و « کەژاوە »ی کاکە مەم بۆتانیو « بێ‌وڵاتی » مـــــەمو « خاڵێك لە پاش ژمارە » و « گەریدە »ی رەؤوف بێگـــەردو

« له پێناوی نانا »ی عەبدوالله میدیاو « کۆچ »ی عەبدوالله ئاگرین و « سەرێکی هەیەو هەزار سەودای » شاکر فەتاحو « زەویەکەی خۆم »ی جەمال بابانو « کانێک »ی ئیبراهیم سەلمانو «کوتەرە خەلوزێك »ی کامیران موکریو « ئاغای ئاوانی » ۱ ـ ب هەوریو زۆری تر ژی .

**8 ـ نامۆبون لەکاتو شتو ژمارە :**

زۆر کەس هەیە لە کۆمەلی کوردمواری خۆمان لە هێندەك شت ناموییەو خۆی دور دێخی لێیانو ئەگەر بێنە پێش چاو خۆی لێ دور دێخیت وەك تەیری قەلە رەش یان رۆژی سێ شەممە یان ژمارەی 13 یان پێکژین .. مرۆڤی کورد هەر وەك مرۆڤی تر لە کۆمەلگەیەکانی تر هێندەك شتی هەیە لێی ناموییەو نایەوی ببینێ یان بێنە ڕێگایەکەیو چیرۆك نوسەکانی ئێمە ئەم شتە ژی یان چارە سەر کردووە وەك چیرۆکی «تانەو ئارەزوو »و « سمکولی ئەهریمەن »ی کاکە مەمی بۆتانیو «رق» کلاوس قەفطان .

**9 ـ نامۆبون بە وێنەی یاخی بونو رەفز :**

مرۆڤ گەر توشی هێندەك حالەتو وەزعی تایبەتی بوو نەیتوانی ئەوی لەدل دایە دەرببرێ بە ئازادی توشی وەزعێکی نامو دەبێو هەمو شتێكو خۆیو دەورو بەری بێ بەها دەزانیو هەمو شتێك رەفز دەکاو لەهەمو یاساو فەرمانو بریارەکان نامو دەبێ و لێیان یاخی دەبێو ئەم شتە بەچاکی مامەلەی لەگەل کراوە لە چیرۆکی کوردی داو بەوێنەیەکی تەواو چارە سەرکراوە وەك چیرۆکی « گەشتێك لە وەستاندا » ی رۆوف بێ گەردو « بازنە » و « خۆر وەدەست دێنین » ی کاکە مەم بۆتانیو « سێ وێنەو ڕێبوارێك » ی مستەفا سالح کەریمو « مۆمی شەماشە وەنحا » ی مەحەممەد مواود مەمو « توانەوە » ی رەئوف بێگەردو « جراخان »ی مەحەمەد رەشید فەتاح « سێبەری ئەسپە شێ » ی مەحەمەد فەریق حەسەنو « عاجباتی هەشتەم »ی مەمو « دوو چیرۆكو عەشقێکی » حوسەین عارف و «کۆمرو هەرچ دلربەری »ی ئیبراهیم سەلمانو زۆری ترژی .

**10 ـ نامۆبونی سێکس :**

مرۆڤ چەند غەریزەیەکی تێدایەو لەگەل کروموسوماتیدا یەك دەگرن لەکاتی لەدایك بونی تا مردن لەگەل مرۆڤ سەردەکەون دوا دەکەون مەزن دەبنو پەرە پێ دەدرێن ئەو ژی وەك خواردنو خواردنەوەو هەناسەکێشانو سێکسو ئەگەر هاتو یەکەك لەم غەریزانە بەند کراو و مرۆڤ لێ دورکراوە ئەم مرۆڤە توشی نامو بون دەبێ بەتایبەتی غەریزەی سێکس ئەگەر هاتو ئەم غەریزەیە کەبت بو لەبەر چەند هۆیەکی دەرەوەی مرۆڤ یان لە بەر شەرمو عەیبی کۆمەلو زۆر شتی تر گری ئەم غەریزەیە وا دێلنەوە دانامرکێننو کەبت دەکەن لە دلو دەرونی مرۆڤدا ئەم مرۆڤە ناتوانی دەریکاو توشی نامو بون دەبێو ئەو هەمو گیروگرفتەی بەدوای دا هەن لە دەورو بەری خر دەبتەوەو ئەم شتە ژی چارەسەر کراوەو چارە سەر دەکرێت لە ناو چیرۆکی کوردیدا وەك « شەفەق » ی حوسەین عارف و « مۆرانە » ی مەحەممەد رەشید فەتاحو کۆمەلە چیرۆکەکانی ئەحمەد سەید عەلی بەرزەنجی بەتایبەتی لە ، دەستەو یەخەی » داو « موچرکە » ی مەحەمەد موکری داو « کاروان سەرای » مەحەممەد رەشید فەتاح و « توانەوەی » رەئوف بێ گەردو زۆری تر ژی .

**11 ـ نامۆبون لە هێزو توانای مرۆڤو پەنا بردن بۆ هێزەکانی میتافیزیکی :**

ئەم جۆرە نامۆبونە لە ناو کۆمەلی کوردی دا باوە کە مرۆڤ نەتوانی بەرامبەر هێندەك روداوی سروشتی یان لقلقینی مرۆڤایەتی بجولێنەوە پەنا دەباتە بەر شتی خەیالی یان میتافیزیکی بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم جۆرە شتانە لەو کاتەدا مرۆڤ لە هێزو توانای سروشتی خۆی نامو دەبێو پەنا دەباتە بەر شتی دور لە خۆیو ئەم جۆرە نامۆبونە لە ناو چیرۆکی کوردیدا چارە سەر کراوە وەك چیرۆکی « کلاو قۆچ » ی شێرکۆ بێکەسو « ناجیە خان » ی حەسەن قزلجیو « فالچی » ی حەمە کەریم هەورامیو پیاو چاکی »ی مەحەمەد رەشید فەتاح و زۆری تر ژی .

**12 ـ نامۆبون لە واقیع بروا بە میثالیات :**

ئەم جۆرە نامۆبونە لەلای هێندەك چیرۆك نوسان دیارە بەلام من هەر شاکر فەتاحو رەزا سەید گول دێنمە بەر چاو کە پالەوانانی چیرۆکەکانیان ئامۆژکاری بە خەلك دەدەنو ڕێگای ئیسلاح لە پێش چاویان دەکەنەوە بۆ ئەوەی چەوتیو خراپە نەمێنێو چاکە بلاو ببێتەوەو ئەم شتە ژی بە مرۆڤ ناکرێن بەلکو خوداوەندە ئەوی ڕێگای راستی دەکاتەوەو توخیبو حەد بۆ خراپە دادەنێ وەك چیرۆکی « نیوەکەم » ی رەزا سەید گولو « مدیر بەگ » و « سەرەکی هەیەو هەزار سەودا » ی شاکر فەتاحو زۆری تر ژی .

**13 ـ نامۆبونی ئافرەت :**

ئافرەت نیوەی کۆمەلە لەبەر چەند رەوشتەو نـــەریتی کۆمەلایەتی توشی زۆر دەردە ســـەری دەبێ وەك بـــەزۆری بەمێردانو لە پێشکەدا بە شودانو کچی بچوك بۆ پـــیرەمێردو مەهری زیاد « قەلەن » تیکهەل نەبونی ژنو پیـــاو کـــەبتی سیکسو زۆر شتی تر دەبنە هۆی ئەوە کە ژن لەو کۆمەلگایەی تێدا دەژی نامو بێو بێ بەهۆی ئەوە یان ژن رێگای خەراپە بگرێ یان لە ژیانەکی نامودا بژی یان بەکوشتن بچێ ئەم هەمو شتانە دیارن لەناو چیرۆکی کوردیدا و بەچاکی چارەســـــەر کراوە وەك چیرۆکی « کاروان » ی مەحەمەد سالح ســـەعید و « خانزاد » ی جەمال بابان و « تاوانم چیبو » و « بەسەر هاتی کنێر » ی کاکە مەم بۆتانی و « ئەمەیە بەشـــمان »ی د. کاوس قەفتانو « دەســـتەو یەخە » ی ئەحمەد سەید عەلی بەرزەنجیو چیرۆکەکانی کۆمەلی « پێش تاریك دابی » ی شـــیرین ك . و ئەنجامی کچ فرۆشی رەئوف بێگەردو « ژن هێنانی بە زۆرە ملی »ی مەحەمەد رەسول هاوار « کوتەرە خەلوزێێك »ی کامیران موکری و « مام هومەر » ی مەحەرەم مەحەمەد ئەمیـــنو زۆر شتی تر ژی .

**14 ـ ناموبون لەبەر جەورو زولمو ستەم :**

مرۆڤ ئەگەر دوو چاری زولمو ستەمو جەور بو توشـــی ناموبون دەبێو سروشتەو واقیعو زاتی خۆی بـــەجێ دێلیو دەربەدەر دەبێو یەکەك لەم دوو وێنانە وەر دەگرێ :

ا ـ خۆ بەخت کردنو نەترسیو لە دژی ئەم جـــەورو زولمە راوەستانو یاخی بون لە هەمو شتێك .

ب ـ رەڤینو هەلاتنو دورکەوتنەوە لە مەیدانی جـەنگ لەگەل ئەم جەورو زولمەو ژیان لە نائارامی دا تا ماوە .

ئەم هەر دوو جۆرانە بـــەچاکی لە ناو چیرۆکی کوردیدا چارەسەر کراون و هەر دوو جۆرە پالەوانمان هەیە لەنـــــاو چیرۆکی کوردی ئێمەدا وەك « نامەیێ بۆ بەندی خانە »و « مومی شەماشە دەنجا » ی مەحەمەد مەولود مەم و « زرەی زەنجیر » ی مستەفا سالح کەریم و « دلسۆزی نەمر » و « لە پێناوی نانا»ی عەبد الله میدیا و زۆر لە پالەوانەکانی ئەگەر ئەلێم هەمویـــان کۆمەلی « بابا نوئیل تۆراوەی »ی عەبد الله ئاگرینو«زەویەکەی خۆم » ی جەمال بابانو « لالۆ کـەریم » ی جـــــەمال نەبەز « بەردەقان » ی ئیبراهیم سەلمانو « ئەسپەشێ » ی مەحەمەد نەریق حەسـەنو زۆر شتی تر .

لە دوایدا بە بەرێزتان رادەگەینم کە ئـــەم باســـەم پێشکەش ئێوەی بەرێز کرد وەك سەرەتایەك بۆ کارێکی گەورەو فراوان بۆ دیراسەتی لایەنەکی گرنگ لە چیرۆکی کوردی دا ئەو ژی « ناموبونە » و هێڤی دارم کە لەو گفتو گۆو موناقەشـــاتی لەسەر ئەم باسە دەکرێت سودی باش لێ وەرگرم بۆ ئـــەوەی کلرەکەم بە تەواوی چاف هەلینێو لە دایك ببێو ئیتر سوپاس.

---

**(1) قاموس المنجد .**
**(2) عالم الفکر ص69 مقال للدکتور مجیب الشارونی .**
**(3) سەرەتای سایکولوژی لندن .**
**(4) عالم الفکر ـ الدکتور مراد وهبە . مقال .**
**(5) و (6) الاداب اللبنانیة ـ والتـــر کاوفمان ع. 2 ـ 3 1979 « حتمیة الاغتراب » .**
**(7) Hand book of Psychatry کیتـــــابی نەخۆشیەکانی دەرونی .**
**(8) الاداب ـ ع 2 ص23 ســـــــنە 1979 « حتمیة الاغتراب » والتر کاوفمان .**
**(9) عالم الفکر ص5 مقالة رئیس التحریر ـ الاغتراب ـ .**
**(10) هێلەکانی سایکۆلۆژی . ل 121 ، چاپی لەندەن**
(London - Psychology Horizon)
**(11) سەرەتای سایکاتری « نەخۆشیەکانی سایکۆلۆژی»**
**Introduction of Psychatry 1974, New York**
**(12) مجلة العربی . عدد نیسان سنة 1981 دستوفسکی کاتبا ومفکرا .**
**(13) الاداب . والتر کاوفمان ع ـ 3 ـ سالی 1979**
**14 ـ عالم الفکر ص 20 مقــــال للدکتور قیس النوری الاغتراب اصطلاحا ومفهوما .**

**سەرچاوەکان :**

**1 ـ مجلة عالم الفکر عدد خاص « الاغتراب » .**
**2 ـ مجلة الآداب العدد الثانی والثالث 1979 .**
**3 ـ قاموس المنجد .**
**4 ـ سەرەتای سایکۆلۆژی**
**Introduction of Psychology.**
**5 ـ سەرەتای سایکاتری « نەخۆشیەکانی سایکۆلۆژی »**
**Introduction of Psychotryci**
**6 ـ هێلەکانی سایکۆلۆژی Psychology Horizon**
**7 ـ گەلەك گۆڤارو رۆژنامـــەو کتێب چاپکـــراوی کوردی « کۆمەلە چیرۆکەکان » .**

لەبەردەم دادگاهدا :

# ڕاستە کوشتویەتی .. یان تاوانبار نیە؟

**ئەم کەینەو بەینەیە پانزە سالی خشت کۆمەلایەتی‌ی ئینگلیزی خەریك کرد بە خۆیەوە !.**

نووسینی :
ئەدگار لیست گارتن
وەرگێرانی : شاکر فتاح

## ئەم نووسراوە

**نووسراوی [ ڕاستە کوشتویەتی .. یان تاوانبار نیە ؟ ] ، کە دانەرەکەی نووسەری بەناوبانگی ئینگلیز [ ئەدگار لیست گارتن ]ە ، پڕە لە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی کە گوێ دەدەنە یاسای خودایی‌و بە دوای دادپەروەریدا دەگەڕێن . هەروەها بۆ ئەوانەیش کە بڕوایان بەوە هەیە کە دەبێ [ ژنو مێردی ] لەسەر بنچینەیەکی خۆشەویستی‌ی دوولایی‌و، نزیکی‌ی ژین‌و گوزەران‌و ، تەمەن‌و، دڵ‌و دەروون‌و ،ژیری‌و تێگەیشتن‌و ، چێژگەی هەردوولا دابەزرێ . ئەم چیرۆکە لەسەرێکەوە ژینێکی پڕ لە خۆشی‌و کامەرانی‌ی ژن‌و مێردی‌ی تێدایە ، کە تا ماوەیەکی هەشت سالی دەخایێنێ ، لەسەرێکی تریشەوە کەتن‌و ڕیسوایی‌یەکی ناکاوو ، ئەنجامێکی پڕ ناکام‌و ، مەرگەساتێکی بەسامی تێدا ڕوودەدات . مێردەکە لە ئینگلیتەرەدا لە دایك بووە ، ژنەکە لە ئەمەریکادا .**

سوروشتی ئەمەریکایی‌یەکانیش لە سوروشتی ئینگلیزەکان گەلێك جیاوازە . ئەمان حەز لەبەرەللایی‌و گۆڕین دەکەن . ئەوان حەز لە خۆپاراستن‌و نەگۆڕین دەکەن . تەمەنی [مایبریك] کە مێردەکەیە ، دوو ئەوەندە پتربوو لە تەمەنی [ فلۆرنس ] ، کە ژنەکەی بوو . مێردەکە چەواشە بووبوو بە جوانی‌و شەنگ‌و شۆخی‌ی ژنەکەیەوە لە ڕووو لەش‌و لاردا ، بێ ئەمەی لە ڕەووشت‌و سوروشتی بخوێنێتەوە . ژنەکەیش چەواشە بووبوو بە سەروسامان‌و سایەو پایەی مێردەکەیەوە ، بێ ئەمەی لە تەمەن‌و ڕەووشت‌و پیشەی بخوێنێتەوە . بۆیەکا لەپاش هەشت سال ژیانی ژن‌و مێردی‌ی ڕێك‌وپێك‌و خۆش‌و پڕ لە کامەرانی ، [ فلۆرنس ] پەلی پچڕیوەو ناپاکی‌ی لە مێردەکەی خۆی کردووەو ، دلداری‌و لنگبازی‌ی لەگەل پیاوێکی تری ئینگلیزدا کردووە . داخەکەم نە نووسەر لە چیرۆکەکەیداو ، نە دادگاهیش لە چەندوچوون کردنەکەیدا ، بەتەنگ ئەم کەتنەوە نەبوون‌و بایەخی پێویستیشیان پێ‌نەداوە . کەچی لەڕاستیدا هەر ئەو کەتنە بووە کە بووە بەهۆی نەخۆش‌کەوتن‌و مردنی [ مایبریك ] لە داخی ئابڕووچوون‌و لەدەس‌چوونی دلدارەکەی. من لەو باوەڕەدام کە ئافرەتەکە ، ئەگەر لە کوشتنی مێردەکەیدا تاوانباریش نەبێ ، لە مردنی مێردەکەیدا تاوانبارە . کەچی نە برای مێردەکە ، نە دادگاه ، خۆیان لەم ڕازی مردنە نەگەیاندووە . بەلکو بە پێچەوانەوە ، دادگاهی دوایی بەرەللاکردنی ئافرەتەکەی بە سەرکەوتنێك داناوە بۆ [ دادپەروەری ] ! ئەمەیش جێی داخە کە هەتا ئێستایش دادگاهەکانی جیهان بایەخیان نەداوە بە کەینەوبەینەی دەروونی، کە زۆر جاری واهەیە هەر ئەوانەن دەبنە هۆی ڕوودانی کەتن‌و ڕیسوایی‌و نەخۆشی‌و تاوانباری ، وەك لەم چیرۆکەدا دەردەکەوێ .

لێرەدا پێویستە ئەوەیش بلێین کە ئەگەر [ فلۆرنس ] ئافرەتێکی سەرڕاست بووایە ، پێویستبوو لەپێشدا خۆی لە مێردەکەی ئاشکرا بکردایە ، کەگرفتاری ئەڤینی [ برایەرلی ] بووەو، دەیەوێ ژن‌و مێردی‌یەکەی خۆی و ئەو هەلبوەشێنێتەوە، تا بتوانێ شوویەکی تازە بە دلداری تازەی بکات . جا ئەو ژیانە تالەی کە پاش هەشت سالەکە تووشی‌هات بە هۆی هوروژمە ڕەواکانی مێردەکەیەوە ، هەروەها ئەو

زیندانی پانزە ساڵی‌یەی کە تووشی‌هات لەسەر دەستی بـەرای
مێردەکەیدا ، کە بە دەرمان‌خواردووکردنی مێردەکەی تاوانباری
کردبوو ، لەبەردەم دادگاهدا ، بام بەهەڵەی یاسایی‌یش دانرابێ
بۆ دادگاه ، لەڕاستیدا [ جەزرەبەیەکی دادپەروەرانەی خوایی ]
بوو ، بۆ ئەو ، لە تۆڵەی ناپاکی‌و دلوتێن‌پیسی‌یەکەیدا ، کە هەر
ئەو کەتنەیش‌بوو — بە باوەڕی‌ی من — بووە هۆی مـــــردنی
مێردەکەی ..

[ دادی خودایی ] لە زۆرور هەموو دادگاهێکەوە کاری خۆی
دەکات ... کاشکی ئێمەیش هەر بایەخمان بە [ دادپەروەری ]
بدایە ، لە ژیانماندا . تا ئێستا ئەمەندە پاش‌نەدەکەوتین !..

ئەوەی شایستەی دڵ‌خۆش‌بوون‌و ڕێزلێ‌گرتنە ، ئەوەیە کە
[ جووڵەی دادپەروەری ] لەدەمێکەوە لەناو جیهاندا پەیدابووە،
چ بۆ تاك‌وتەرای کەسان ، چ‌بۆ گەلان . لەگەڵێك شوێنیشـــــدا
دادگای ڕاستەو دوروست پەیدابوون ، کە سەر بۆ هیچ هێزێك
دانانەوێنن ، بۆ ڕاستی‌و دوروستی‌و دادپەروەری نـــەبێ .
یەکێك لەوانە ئینگیلتەرەیە کە ئەمە نزیکەی سێ‌سەد ســــاڵە
خەبات دەکات بۆ ئەم ئامانجە . لەم چیرۆکەیشدا کە نموونەیەکی
ئەو جووڵەی دادپەروەری‌یەمان بۆ دەردەکەوێ ، هیوادارم کە
لە خاکەکەی خۆیشماندا ئەو جووڵەیە پەیدابێ . لەڕاستیدا
[ شارستانێتی ]ی هەموو نەتەوەیەك بە ڕاگرتنی دادپەروەری‌ی
ئەندازەی دەگیرێ . چونکە ئامانجەکانی مرۆڤ لە ژیانیدا هـــەر
لە ناوچەیەکی پڕ لە دادپەروەری‌دا دێنەدی . ئامانجـــەکانی
مرۆڤیش هەر ئەوەتا کە دادی بپرسرێ‌و ، مافی بپارێزرێ‌و ،
بتوانێ سەربەستانە ، بێ‌وەی بە خۆشی‌و شادمانی‌یەوە بـژی.
ئامانجەکانی گەلانیش هەر ئەمانەن . بەڵام دەبێ ئەوەیش بزانین
کە نە تاك‌وتەرایانی کەسان ، کە نە گەلان ، بەم ئامانجانەگەن ،
تا خۆیان پاك‌نەکەنەوە لە کەتنی زۆرداری‌و خوێنیشیان پەروەردە
نەکەن بە ڕەو شتی دادپەروەرانەوە . ئەمەیش [ خوێندەواری ]
نەبێ چارەی ناکات . واتا فێربوونی زانستەو ، خۆڕاهێنانیش
بە چاکی‌یەوە ، لەگەڵ خۆدوورخستنەوە لە خراپی .

ئێمەی کوردەواری‌یش کە تا ئێستا بایەخمان نەداوە بـــە
[ دادپەروەری ] سزای خۆمان چێشتووە ، کە ئەویش دیلی‌ی
دەستی بێگانەبەو دەستی خۆمان !.

جا ئەگەر بمانەوێ چێژگەی ژیانێکی چاکترو پاکتـــرو
جوانتر بکەین، پێویستە بایەخ بە [ دادپەروەری ] بـــدەین .
بەڵێ (دادپەروەری) . هەتا دەیش‌مێنین هەر [ دادپەروەری ].

**شاکر فتـاح**

**سلێمانی:27ـ2ـ1966 «خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کوردا»**

## سەرەتای چیرۆکە کە

چیرۆکی [ فلۆرێنس مایبریك ] کە برانەوەیەکی پڕ خەفەت‌و
سزای هەیە ، لە جیهانی نوێ‌دا دەستی پێ‌کردووە ، لە ساڵی
1881 دا ... لەو ساڵەدا [ جێمس مایبریك ] ڕابەرێکی گەورەی
لۆکە فرۆشتن بوو ، لە شاری [ لیفەرپوول ]دا . بـــە هۆی
کاروبارە گەورەو فراوانەکەیەوە هاتبووە سەردانی ئەمەریکا .
ئەو کاتە لەسەرەتای تەمەنی چل ساڵەی دا بوو لەشیکی بەهێزو
تونلو تۆلی پێوە بوو ، حەزی لە وەرزش دەکرد . ڕوویـــەکی
خۆشیشی هەبوو . بێجگە لەمانەیش ، هـــەموو ، پیاوێکی
سەرکەوتوو بوو ، لە کارو فرمانەکانیدا ، دەرامەتیشی بەجگار
باش بوو .

لەو گەشتەیدا چاوی بە خانم « فلۆرێنس شاندلەر » کەوت‌و
ناسی ، کە کچی کارگێری یـــەکێ لـــە پـارەگۆڕینەوەخانە
سەرکەوتووەکانی خاکی [ ئالاباما ] بوو . « فلۆرێنس » لـەو
کاتەدا لە تەمەنی هەژدە ساڵی تێپەڕی نەکردبوو . کچێکی تەڕو
پڕ بوو . شەنگ‌و شۆخی‌یەکی وایشی پێوە بوو ، دڵی پیـاوی
کێش دەکردو ، فریوی دەدا بۆ ڕەگەزبلێزی ، بـەژن‌وباڵایەکی
جوانیشی پێوە بوو لەگەڵ دەموچـــاوێکی وەکو گوڵدا ..
[ مایبریك ]یش دڵی بەم کچە داچوو . نەیشگەڕایەوە بـــۆ
ئینگیلتەرە بەناو ئاودا ، تا ئەوی مارەکردو لەگەڵ خۆیـــدا
بردی‌یەوە !.. زاواو بووك لە شاری [ ئیجبریث ]دا کەلە نزیك
شاری [ لیفەرپوول ] دابوو ، لەناو خانوویەکی گەورەدا ژیان ،
کە پڕبوو لە هەموو بابەتێکی خۆش‌ڕابواردن ، کـــە لەشکرێکی
بچووکی دەس‌وپێوەندی پێوە خـــەریك بوو .. ژیـــانی
ژن‌ومێردی‌یەکەیان بێ‌دەنگ‌وسەنگ بوو ، پڕ بوو لە خۆشـی‌و
ئاسوودەیی ... دوو منداڵیشیان بوو ، کە بە چەشنی گوڵ
ماڵەکەیان ڕازاندبووەوە .. لە بەرئەوە ، ژیانەکەیان لـە هیچی
کەم‌نەبوو ، پڕیش‌بوو لە ڕێك‌و پێکی‌و کامەرانی ..

... بەڵام لەپاش هەشت ساڵێکی خۆش‌و بێ‌دەنگ‌وسەنگ
کەلـەو ژیانەدا دەژیان ، واتا لە سەرەتای ساڵی 1889 دا ،
[ فلۆرێنس مایبریك ] دەستی‌کرد بە جەربەزەیی‌یەکی دەها کـە
ئەنجامی بە چاك نە دەهاتەبێش‌چاو ، چونکە لەناوەند ئـــەوو
پیاوێکدا کە ناوی [ برایەرلی ] بوو ئاشنایەتی‌و دۆســـتایەتی
دامەزرا ، کە دوایی گۆڕراو بوو بە دلداری . ئـافرەتەکەیش
ئەوەندە گرفتاری خۆشەویستی‌ی پیاوەکە بوو بوو ، لە مانگی
نەورۆز [ مارت ]ی ئەو ساڵەدا ، بە درۆ مێردەکـــەی خۆی
چەواشە کردو ، بە بیانووی ئەوەوە کە لە شاری [ لەندەن ]دا

نەشتەرکاری یەکی گرنگی خزمێکی دەکەن ، چووە [ لەندەن ] . لەوێ چووە ناو میوانخانەیەکی واوە کە زۆر بەرچاو نەکەوێ ، تا سێ شەوو سێ ڕۆژی خشت لەگەڵ پیاوەکەی دۆستیدا بە دلداری و لنگ‌بازی‌یەوە ڕایبوارد . [ فلۆرنس ] ئەودەمـــە لەتەمەنی بیستو شەش سالیدا بوو . کـــەچی مێردەکەی گەیشتبووە تەمەنی پەنجا سالی !..

## ماڵ کەوتە ئاژاوەوە !..

پاش ئەوەی [ فلۆرنس ] لە [ لەندەن ] گەڕایەوە ، چووەوە سەر مالی خۆی . هەروەك ئەو سێ شەوو سێ ڕۆژەیشی بـــە بەزمو ڕەزمەوە ڕانەبوواردبێ لە میوانخانەکەی لەندەندا وابوو !. ئێمە وای دادەنێین کە مێردەکەی بەوەی نەزانیبوو کـــــە [ فلۆرنس ] لە ڕێکەی داوێن‌پاکی لایدابوو . بەلام خۆ ئـــەوە ئاشکرابوو کە [ مایبریك ] لە ئەندازەی خۆی زۆرتر هۆگـــری ژنەکەی بووبوو . زۆرتریش دلنەوازی‌ی دەکـــرد . لەبەرئەوە توانجو پلاری تونلوتیژی دەگرتە [ فلۆرنس ] . کە لە دوایـــدا گۆڕراو بوو بە دەمەقالی . پاشان گەیشتە لێدانی [ فلۆرنس ]ی پەری‌ڕوو کە دەموودەست چاوێکی‌و لووتی ئاوساند !.. بێ‌گومان فلۆرنس لەمە تووڕە بووو هەڕەشەیشی کرد کە مالەکـــــە بەجێ‌بهێلێ .. خۆ ئەگەر مندالەکانی لە ئارادا نـــەبوونایە ، دەموودەست مالەکەی بەجێ ـ دەهێشت... پاش ئەوە پزیشکی خێزان هاتە ناویانەوە ، ئاشتی‌کردنەوەو ، ژیانیشیان گەڕایەوە سەر دۆخی جاران ! ئەوەندە هەبوو ، شەڕوەستاندنەکە هەر بە سەرزاری بوو . لە ژێرەوە پشم‌و قین هەر لە دلدا مابوو !.. چونکە هەر ئەوەندە مانگێکی بەسەرداچوو ، کـــە ئەوشەڕو هەللایە لە ناوەند هەردووکیاندا قەومابوو ، نیشانەکـــــانی نەخۆشی‌یەك بە « مایبریك »ەوە دەرکەوتن ، کە هەتا نەیکوشت لە کۆلی نەبووەوە !..

ئەو نیشانانەیش لەناوەند ڕشانەوەو سك‌ئێشەدا بوون . پاشان [ مایبریك ] چاك دەبووەوەو ، دەهاتەوە سـەرخۆی ، کەچی زۆری پێ‌نەدەچوو ئێش‌و ئازارەکانی بۆ پەیدا دەبوونەوە .. پزیشك لەدوای پزیشکیش دەهاتن‌و دەچوون. هەرچەندیان دەکرد ، ئەنجامێکی تەواویان دەست‌نەدەکەوت . پاشـــــان براکەی لە لەندەنەوە هاتە لای ، لێ‌ی نەدەبووەوە . چونکـــە لەشی تێکچوو بووەوەو بە پەلە بەرەو نەمان دەچوو !..

دوایی [ مایبریك ] مرد !.

مالەکە گەڕان . لە ئەنجامی پشکنین‌دا : « زەرنیخ »یـــان دۆزی‌یەوە ، لەناو قاقەزدا ، بە پێچراوەیی، لەناو شووشەدا.. هەندێکیشیان لێ‌ڕژابووە سەر جل‌و بەرگو ڕایـــەخ‌و ڕووی دۆشەك!.. لە هەموویشی گرنگتر ئەوە بوو کە هەندێـــــك شی‌کردنەوەی ساکاریان دەست‌پێ‌کرد لەناو لەشی «مایبریك»دا: پێ‌شوێنی زەرنیخیان دۆزی‌یەوە . بەم ڕەنگە « مایبریك » لـــە 11ـ5ـ1889 دا مرد . لە 13ی ئەو مانگەدا نێژرا . لە 14ی ئەو مانگەیشدا « فلۆرنس »ی ژنی گیراو خرایە بەندیخانەوە ، بەو ناوەوە کە « مێردەکە خوی دەرمان‌خوارد کردوە کوشتوێتی هەروا بە ئارەزوو ! .. » .

## بیرو باوەڕی گشتی فلورنس

## تاوانبار دەکات !..

تاوانبارکردنەکە هەرچەندی کاریگەر پێ‌و ، ببێتـــە هۆی بێ‌دەنگ سەنگی ، یاخود شۆڕش هەلگیرســـــاندن ، یان تووڕەبوون ، خاوبوونەوەو بڕستبڕان ، بـــەلام زینـــــدانی بەندیخانەکە بەرەیی‌ی بە کەسدا نایەتەوە .. تاوانبـــــاری گیراویش هاواری بە کەسدا ناگات، بەو دۆستو کەس‌و کارانەدا نەبێ کە لەو دیو شیشە ئاسنەکانەوە دەوەستن .. [فلۆرنس ]ی بەسەزمانیش لەو جۆرە دلخۆشکەرانە بێ‌بەش بوو . چونکـــە لەوناوەدا نە کەس‌و کاری هەبوو ، نە دۆستیشی بـــۆ پێکەوە نرابوو ، کە دلی‌بدەنەوەو پشت‌گیری‌ی بکەن‌و ، هیوایش بخەنە دلیەوە . کەس‌و کاری فلۆرنس هەموو لەوپەڕی رزێ گەورەکەی ئەتلەسی‌یەوە بوون . واتا لە ئەمەریکا بوون . ناســــــیاوە ئینگلیزەکانیشی ڕووی خۆیان لێ وەردەگێڕاو ، لچیـــان لێ هەلدەقورتاند !.. دوایی دەسگای یەکێك لە پشتیوانەکان دلی پێ‌ی سووتا لە [ لیفەرپوول ]دا ... « سێر چارلس ڕاســـل » بوو بە جێ نوشینی ژنەکە ، تا لەسەری‌بکاتـــەوە . ئـــەم پشتیوانەیش گەورەترین پشتیوانی ئینگلیـــز بوو لـــــەو سەردەمەدا . تەنانەت دەلێن گەورەترین پشتیوان (محامی)یش بووە کە دادگاهەکانی ئینگلیز تا ئەو دەمە چاویان پێ‌ی کەوتووە. دەنگێکی گەورەی بووە . بە هێزو هەڕەتیشەوە لەســـــەر تاوانبارەکەی کردۆتەوە ، سامێکی گەورەیشی هەبووە لەنـــاو دلی کەسانی‌تردا .. ئەوانەی ئاگایشیان لە کەینـــەو بەینەکەی بووە ، هەرچەندێ وورباو بـــە هێـــــز بووبن ، لەبـــەردەم چەندوچوون‌کردنی ئەودا خۆیان پێ‌نەگیراوە .. ئەو لەوانەیش نەبووە، کە دادگەرەکان خۆیشیان لە دەست سەرزەنشت کردن‌و هورووژمەکانی ئەو ڕزگاریان‌بووبێ .. ئەگەرپێویستی کـــردبێ ، گوێ‌ی نەداوەتە کەس ، وەك هـــــەورە تریشقە هورووژمی بردۆتەسەر بەرامبەرەکان‌و ئاگالێ‌بووەکان‌و پیاوانی تاوانبـــــار کردن .. ئەو بەتەنگ ئەوەوە نەبووە قـــــە برازێنێتەوەو ، پێچ‌وپەنا بکات لە قسەکردندا ... ئەو چەکـــەی بەدەستیەوە بووە ، هێزوهەڕەتی بووە ، نەك زمان ئارایی‌ی !.

لەبەرئەوە ئەو دەمەی پرسکردنو لێکۆڵینەوەی تێـــدا دەکرا ، بە چەشنی ئەوەی ڕوون بکەیت بە سەر ئاگرداو گـــری زۆرتر تێبەربدات ، دوودڵیی کەسانیتریش تا دەهات دەبوو بە بیروباوەڕێکی بنچداکوتاو کە ئەو ئافرەتە بێگانەیە نەبێ ، کەس ئەو کوشتنەی لەدەستنەهاتووە . تەنانەت لە شـــاری [ لیڤەرپوول ]دا کەس نەما کە بڕوای بە تاوانباریی ئەو ژنـە نەبێ !.. تەنانەت دەنگوباسی ئـەم کەینەوبەینەسامناکەیش کەوتە ناو لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانەوە وە سەر زمانی کۆمـــەڵانی نەتەوەوە . ئەوەتی ئینگلتەرە هەبوو ، هیچ کەینەوبەینەیـەك ئەوەندەی ئـــەم کەینەوبەینەیە نەتەوەی بـــە خۆیـــەوە خەریكنەکردبوو ، مەگەر کەینەوبەینەکەی « ئۆســـکار وایلد » نەبێ کە لەوەپاش پەیدابوو !.. لە بارێکی وایشدا یاســـای ئینگلیز ڕێدەدات بە تاوانبار کە داوابکات کەینەوبەینەکـــەی لەبەردەم دادگاهێکی تردا تەماشابکرێ . چونکە بڕیاردان بـــە بە تاوانباری ، یاخود بە بێتاوانی بەرەو ڕووی سوێندخۆرەکان کراوەتەوە ، کە ئەوانیش لە دانیشتووانی شارەکـــەن . بەڵام ئەگەر بهاتایە، کەینەوبەینەکە لە شـــاری [ لیڤـــەرپوول ]ەوە بگوێزرایەوە بۆ شاری [لەندەن] ، ئەوە بۆ دڵنیایی‌ی تاوانبارەکە لە دەروون خاوێنیی سوێندخۆرەکان نزیکتر دەبوو !.. کەچی پشتیوانەکانی فلۆرنس ئامۆژگارییان وا کرد کە دادگاهەکەی نەگۆڕێ ، تا بێ تاوانیی ئەو ، هەر لەوشارەدا دەربکەوێ کـــە تاوانبارییەکەی ئەوی گوێلێبووە !..

### بەڵگەکانی دەسگای تاوانبارکردن

### بەسەر تاوانباریی ژنەکەوە

نوێنەری دەسگای تاوانبارکردن ، لە پیاوە هەرە گەورەکانی ئەوێ بوو . بەڵگەو نیشانەکانی تاوانەکەی لـــە شـــێوەیەکی ڕێكوپێكو ئاشکرا دا پیشان دابوو :

نوخشەی ئەو نیشانانە « قاقەزی مێش کوشتن » بوو . کە ئەویش قاقەزێکی لینج بوو ، بە ڕووەکەیەوە چینێك زەرنیخ دانرابوو . لەپێش داهێنانی دەرمانپرژێنەکاندا کە بۆ کوشتنی مێشو مەگەز بەکاردەهێنرێن ، لە کۆگای دەرمانەکانیشـــدا دەفرۆشران ، بێ ئەمەی پێویستیی بـــە ڕێدانی پزیشکێك بووبێ .

بەڵگەی دووەمیش ئەوە بوو کە « پوختەی گۆشت »ە کـــە هەندێك زەرنیخی تێکرابوو !..

بەڵگەی سێهەمیش ئەوە بوو کە ژنە تاوانبارەکـــە پێش مردنی مێردەکەی بە سێ ڕۆژ نامەیەکی نووسیبوو بۆ دلدارەکەی خۆی کە ناوی [ برایەرلی ] بوو !

بنچینەی تاوانبار کردنەکەیش لەسەر ئەوە دامەزرابوو کە قاقەزی مێش کوشتنەکە کراوە بە سەرچاوەی ژەهری زەرنیخ. کە ژنەکە بەهۆی ئەوەوە مێردەکەی خۆی دەرمـــــانخوارد کردبوو ... ژنەکە لە 24ـ4ـ1889دا دەستەیەك لەو قاقەزی مێشکوژانەی لە دەرمان فرۆشـێك کـــڕیبوو . لە ڕۆژی 29ـ4ـ1889دا دوو دەستەی تریشی لەو قاقەزانە کڕیبوو لە دەرمان فرۆشێکی تر هەندێ لە دەستوپێوەندەکانیش چەنـد قاقەزێکیان لەو قاقەزانە دیبوو خرابوونە ناو جامێکەوە کە ئاوی تێدابوو بوو ، پەشتە مالێکی درابوو بەســـەردا لـــە ژووری نوستنی نەخۆشەکەدا !.. نوێنەری تاوانبارکردنەکـــە لەوەدا هونەری نواندبوو کە مێژووی کڕینی ئەو دوو دەســـــــتە قاقەزی مێشکوشتنەی دوایی‌یەی بەستبووەوە بەو دەمەوە کە تۆزێ لەپێش ئەوەدا نەخۆشەکە چـــاك بووبووەوە لـــەپاش ژەهرخواردنەکەی یەکەمی !..

بەڵام هێشتاش کە پێت بڵێم !.. لەڕاستیدا هۆی گومـان بردن بۆ ئەوە بەشناکات کە بە بەڵگەی تەرلو دابنرێ بـــۆ چەسپاندنی تاوان لە ڕووی دادگاهدا .. لەڕاستیدا کـــڕینی قاقەزی مێش کوشتنەکە ڕاستەدەرچوو . ئەو قاقەزانە پیـاو دەخەنە سەر ئەو بیرەی [ ئەو گومانەی ] کە ئافرەتەکـــــە ویستوێتی ژەهری زەرنیخیان لێ دەربهێنێ .. بـــەڵام بەڵگەی وا بە دەستەوە نیە کە بە تەواوەتی ئەوە بچەسپێنێتە دڵەوە کە ئافرەتەکە ، بەڕاستی زەرنیخەکەی لەو قاقەزانە دەرهێناوە. هەروەها بەڵگەی وایش بە دەستەوە نیە کە بەتەواوەتی ئەوە بچەسپێنێتە دڵەوە کە ئەو زەرنیخەی لەو قاقەزانە دەرهێنراوە بۆ چ مەبەستێك بەکارهێنراوە .. هەرچی پوختە گۆشتەکەیشە، نیشانەی تاوانەکەی باشتر پێوە دیارە . ماوەی تاوانبارکردنی تێدا فراوانترە .

لە کورتی بیبرینەوە : لە زۆربەی ڕۆژەکانی نەخۆشـــیی ( مایبریك ) دا بەشی دوایی ژنەکەی ، خۆی ، سەرپەرشتیی خواردەمەنیو دەرمانەکەی دەکرد . تا ئەم دوایی‌یە ، کە ئەوە بوو ئافرەتە دەسو پێوەندەکانی نـەخۆشخانە پـــەیدابوون ، چاودێریی نەخۆشی‌یەکەی ( مایبریك )یان دەکرد .. جا یەکێك لەو ئافرەتە نەخۆشکارانە چلوی لێدەبێ کـــە [ فلۆرنس ] دەسکاریی شووشەکەی پوختەی گۆشتەکە دەکات ، ئەویش تۆزێ لەپێش ئەوەدا کە [ مایبریك ] شـــتێکی لێبخوات !.. نەخۆشکارەکەیش بەتەنگ ئەوەوە دەبێ کە لەو شـــووشەیە هیچ بە نەخۆشەکە نەدات ... دوای ئەوە لە شـــێوەیـــەکی کیمیایی‌دا تاقیکردنەوە کرا : دەرکەوت کە لەو شووشەیەدا لەتکە تۆوی خەرتەلەیەك زەرنیخی تێدابووە !..

